

یەکێتی ی نیشتمانی ی کوردستان
دەزگای چاپ وبڵاوکردنەوە
- ١٠ -

# چەند نامەیەک

# لە زیندانی فاشیستەکانەوە!

چەند نامەیەك

# لە زیندانی فاشیستەکانەوە

دەزگای چاپ و بلاوکردنەوە

**چی ئاوی بوشه هیدی وه‌کن شیوه‌ن و گرین**

**نامرن ئه‌وانه واله‌دلی میلله‌تا ئه‌ژین**

## پیشکه‌شه به:

- ئه‌و دایکه جگه‌ر سووتاوه سه‌لارانه‌ی که روله‌ی دلیـــر و جوامیری ئه‌وهایان په‌روه‌رده کردووه .
- تیکوشه‌ره شورشگیره‌کانی ریگای رزگاری کوردستان . که بی لادان و کولدان وه‌ستاون . ریگه‌ی پر له کـــویـوه وه‌ری و سه‌روه‌ری ئه‌و شه‌هیده نه‌مرانه ده‌گرنه به‌ر . لــه ســه‌ ری ده‌رون . هه‌تا زولم و زورداری نه‌ته‌وایه‌تی ،و چه‌وسانـه‌وه‌ی چینایه‌تی له ره‌گ و ریشه‌وه ده‌رده‌هینن .

# ◦ پێشەکی ◦

زەبر و زەنگ و ... توقاندن و ... ئیعدام کردن تاکە زمانێکە کار بەدەستە نازییەکانی ڕژێمەکەی بەغدا سەریانی لێ دەرچێت و کاری پێ بکەن . هەزاران نموونە لەم ڕۆژەوەی جڵەوی حوکمڕانی عێراقیان گرتۆتە دەست بەسەدەزاران ڕوانە و نیشتمان پەروەریان لە سێدارە داوە و لە ژێر ئازاردانی کاتی (( بەناو لێکۆڵینەوە )) دا کوشتووە ... بچووکترین سەرپێچی لە خواست و ئارەزووی ئەم تاقمە نازییە ئەنجامەکەی گوللە باران و هەڵواسینە ، یاخود مردنێکی لەسەرخۆ لەژێر زەبری سوندە و کێبل و گسک و ئەشکەنجەدا ...

ئەم دیاردەیە بە شێوەیەک تەشەنەی کردووە یەک پارچە عێراق بۆتە گۆمی خوێن و بە دەگمەن خێزانێک ئەدۆزیتەوە ڕۆڵەیەکی هەڵنەواسرابێ یاخود بە دەست پیاو کوژ و جەللادەکانی (( صدام )) نەغەوتابێ ... لەم ڕووەوە ناو بە ناو لیژنەی (( مافی مرۆڤ )) و ڕێکخراوی لێبووردنی جیهانی (( منظمة العفو الدولية )) دەیان بەڵگەیان خستۆتە

بەردەم رای گشتی جیهانی و هەروەکو لە یەکێک لەو بڵاوکراوانەدا هاتووە :

(( سەربەستی مرۆڤ لە عێراقدا نەک هەر پێشێلکراوە بگرە زۆریش لە مەترسیدایە )) .

ئاشکراشە ، بۆ بەربەست کردنی بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کوردمان جۆرەها لیژنە و دادگای کارتۆنی و دڕندانەی دامەزراندووە کە پیشەیان تەنیا دەرکردنی (( حوکمی ئیعدامە )) بەرامبەر ئەو کوردانەی بە تۆمەت و تاوانی کوردایەتی و پێشکەوتنخوازییەوە رایپێچی بەندیخانەکان کراون ، گوایە رژێم بەم هەڵپە هەڵپ و تۆقاندنە چاوی خەڵکی دەترسێنێ و بەری لێشاوی لەبن نەهاتووی کورد دەگرێت .

ئەم دادگا (( ئەمنی )) یە کارتۆنیانە نەک تەنیا بێ بەرین لە سادەترین شێوەی یاسایی بەڵکو قەوارەیەکی دڕندانە و نامرۆڤانەی ئەوتۆیان وەرگرتووە نموونەیان لە مێژوودا زۆر کەمە .

ئەو نامانەی کە لێرەدا دەیان خەینە بەردەم لیژنەی (( مافی مرۆڤ )) و رێکخراوی (( لێبووردنی جیهانیی )) و رای گشتی و هەموو کوردێکی دڵسۆز ٠٠٠ نامەی دەیان رۆڵەی کوردی بێتاوانە کە پاش ئەوەی لە لایەن کاربەدەستە فاشییەکانەوە حوکمی ئیعدام دراون و رەوانەی قەسابخانەکەی مووسڵ کراون بۆ جێبەجێ کردنی حوکمەکە ٠٠ چەند سائێک ٠٠ یاخود چەند رۆژێک بەر لە سێدارەدانیان نووسیویانە و تیایدا باسی چۆنیەتی ئیفادە لێوەرگرتن و

شێوەکانی ئازاردان و ... دواجار ئیعدام کردنیان دەکەن . تێکڕای نامەکان لەم چەند خاڵەدا یەك دەگرنەوە :

یەکەم : ئەو لیژنە (( ئەمنی )) یانەی بەناو لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا دەکەن هیچ شێوەیەکی یاساییان نییە و زۆربەی لە ئەنجامی ئازاردان و لێدانێکی کوشندەوە پەنجەیان پێ مۆر دەکرێت .

دووەم : ڕەچاو کردنی دڕندانەترین شێوەی ئازاردان لە کاتی لێکۆڵینەوەدا هەر لە بوکس و شوندە و لە کارەبادان و بە پانکە هەڵواسینەوە هەتا لە تونێ دان و بەکارهێنانی گاز و پلایس بۆ گۆشت پچڕاندن و نینۆك هەڵکێشان و ... تاد .

سێیەم : ئیمزا پێکردنی بە زۆر لە سەر داغەری سپی و دوا جار پڕکردنەوەی کاغەزەکە بە گوێرەی ئارەزووی خۆیان .

چوارەم : بەکارهێنانی جۆرەها دەرو نیل و ئوسلوبی ناپیاوانە بۆ خەڵەتاندنی گیراوەکە .

پێنجەم : دەرکردنی حوکمی ئیعدام تەنانەت بەرامبەر بەو کەسانەی پەیوەندیان بە هیچ ڕێکخراوێکی سیاسییەوە نییە و لەوەندە زیاتر چەوساوەیەکی کورد ن هیچ تاوانێکی تریان نییە .

شەشەم : نەدانەوەی تەرمی ئەو شەهیدانەی لە سێدارە دەدرێن بە کەس و کاریان بۆ شاردنەوەی نیشانە و پاشماوەکانی لێدان و ئازاردان .

ئەم نامانە ، چەند بەڵگەیەکی زیندوون بۆ دەرخستنی ڕادەی دڕندایەتی ڕژێمە گەندەڵەکەی ( صدام حسین ) و پەردە لە سەر ژوورە تاریك و ژێر زەمینە سارد و گەرمەکانی

((ئەمن)) و((ئیستیخبارات)) لادەدەن ، لە هەمان کاتدا بەلگە نامەی سەروەرین و قارەمانیەتی و فیداکاری خاوەنەکانیان دەسەلمێنن و دووپاتی دەکەنەوە کە چەندەی زەبر و زەنگ و توند و تیژی لە بەرەودا بێت دەنگی نارەزایی و خەبات و شۆرشگێری زیاتر بەرز دەبێتەوە ..

ڕوانە ئازا و جوامێرەکانی کوردستان وەك بە گەسـید ەوە ـەلماندیانە لە مردن سڵ ناکەنەوە و بە ئاگەشکەو زەردەخەنە و هوتافی لێدانیان بەرەو بەتی سێدارە دەڕۆن و تا ئەو چرکەیەی بەنی ئاشستەکان دەخەنە گەردن نموونەی شۆڕشگێری خاوەن بیر و باوەڕ و پێشمەرگەی کۆڵنەدەرین ، بەمەیش ئەو ڕاستیە دەکەن کە گەلێك بەم جۆرە لە پێناوی مافی بێ شێل کراوی خۆیدا پێشوازی لە مردن بکات ئەمڕۆ یان سبەی دەوور یان نزیك ، تێکڕای ئامانج و داواکاریەکانی دێنە جێ و بەوپەڕی شانازییەوە یادی ئەو شەهیدانە دەکاتەوە کە گیانی پاکیان بووە پردی پەڕینەوە و سەرکەوتنی شۆڕش ..

لێرەدا چەند تێبینیەك دەخەینە پێش چاو :

١ ـ ئەم نامانە بریتین لە نامەی ئەو شەهیدانەی لە دوای ساڵی ١٩٧٦ ەوە لە قەسابخانەکەی مووسڵ لە سێدارە دراون ، سەرجەمی نامەکانیش لە ڕەدهەی ئیعدامەوە نووسراون .

٢ ـ ژمارەی نامەکان ئەوە ناگەیەنێت کە تەنیا ئەوەندە شەهید لە سێدارە دراون ، بەڵکو هەر ئەوەندەیان بووار و دەرفەتی نامە نووسینیان بووە .

٣ ـ نامەی ئەو شەهیدانەی لیرەدا بلاویان دەکەینەوە هەموویان سەر بە ( یەکێتی نیشتمانی کوردستان) ن واتە شەهید زۆرن و نامەی تریش هەن بەڵام دەستی ئێمە نەکەوتوون .

٤ ـ بێگومان گەلێ نامە و نووسراوی تری شەهیدە نەمرەکانمان کە لە ژووری سیدارەوە نووسراون بەڵام بەداخەوە جاری هەر ئەوەندەمان پێ کۆ کرایەوە ، بەو هیوایەی لە چاپی دووەمدا ژمارەیەکی تریشمان دەست بکەویت .

٥ ـ دەوری سەرەکی ئەم کتێبە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بەرا تێکۆشەرانەی نامەکانیان لای خۆیان پاراستبوو تەنانەت لە ڕۆژانی بوردمانی فرۆکە و جەنگی ڕوو بە ڕووشدا هەمیشە لە بیریان بووە و لە فەوتان ڕزگاریان کردووە ، بەتایبەتی هەڤاڵ مام جەلال و کاک نەوشیروان و کاک فەرەیدون و مامۆستا جەعفەر و کاک عەلی بچکۆل و کاک شەماڵ و حاجی مەمو ، بێگومان بەمەیش خزمەتێکی گەورەی شۆڕش و بزووتنەوەی ڕزگاری خوازی گەلی کوردیان کردووە کە جێگای ڕێز و سوپاسی گشت لایەکن .

٦ ـ نامەکان چۆن نووسراون هەر ئەوهایش بە بێ هیچ دەسکارییەك بلاوکرانەوە ، بۆیە لە کاتی خوێندنەوەدا دەبێ هەمیشە ئەوەمان لە یاد بێت کە لە ژووری سیدارەو لەسەر کاغەزی "کلینیکس" و کاغەزی جگەرە نووسراون . تریە تربی هەنگاوی

پاساولەکەی بەر دەرگا و پشکنینی ڕۆژانـــەی ژوورەکە دەوریکی گرنگیان گیراوە لـە کـاتـــی نووسینەوەیدا بۆیە هەندی جار ڕشـتەکـــان تیکەلاو دەبن و جاری وایش هەیە پچـر پچـر دەکەونە پیش چاو.

٧ ـ بلاوکردنەوەی هەندی لەو بڕگانەی پەیوەندیان بە کار و باری ڕیکخستن و کیش و کاری ناوخـــوی شۆرشەوە هەیە لە هەل و مەرجیکی وەك ئەمرۆ دا ناگونجیت بەو هیوایەی لە چاپەکانی داهاتوداو لە گەل گرنگدانی خوری سەرکەوتنا بە شیوەیەکی تر چاپ بکرینەوە.

٨ ـ کومەلی نامەی تریشمان لایە کە ئەو شـەهیدانـە نووسیویانە لە سەنگەری خەباتا شەهید کـــراون بەلام وەك ووتمان ئەم نامانە بە گشتی لـــە ژووری سیدارە نووسراون، بەو هیوایەی نامەکـــانـی تریش لە بەرگیکی سەربەخودا چاپ بکـریـن.

٩ ـ لە بەر چەند هویەکی تایبەتی وامان بـە چـاك زانی ناوی ئەوکەسانە نەبەین کە نامەکانیان بـــو هـاتـــووە.

بەلی ... چەندین سالە کوردستان هەر بەشـی ناپالم و ویران بوون و گوللەی تفەر و توناکەری داگیرکەرانە. چەندین سالە لاوی کورد بە عەشقەوە بەرەو پیری مــــەرگ دەچیت و تا ئەو چرکەیەی بو دوا جار هەناسە ئال ئاوایـی لە گیانی دەکات هەر دەلی : کوردستان ..یان.. نەمان.

ئەمرو لە جیاتی تراکتور و هەوجار ٠٠تانـــك و زوری پوش زەوی و زاری کوردستان دەکیلن ٠

ئەمرو ئاسمانی ولاتە شیرینەکمان ، لە جیاتی جریوەی ئەستیرە و تریفەی مانگ بە هەوری رەش و چلکن وەك کوپتەرو میك ، داپوشراوە ٠بەلام سبەینی :

لە نیوان لوتکە بەفرین و سەرکەشەکانەوە، بە زەبـــری هیزی بیر و باوەر بە چەکی شانی پیشمەرگەی تارمان لـــە لوولەی کلاشینکوف و برنەوەوە خوری ئازادی گزنگ دەدات و ئەوسا سەر لە نویوە مەزرا و کیلگەکانمان سەوز دەبنـــەوە و چـــرو دەردەکـــەن ٠

سەر لە نوی، گوندە راگویزراوەکان ئاوەدان دەکەینەـ وە و دلی هەموو کوردیکی دلسوزیش بەو پەری ریـــــز و نوازشەوە یادی شەهیدە نەمرەکانمان دەکاتەوە و پەیکـــەری سەروەریان بو دروست دەکەین ٠

بەلی ٠٠٠ سبەینی :

خوینی شەهیدان دیتە زمان و دەلیت: ئوخەی٠٠٠ بەخیرو نەرویشتم و ئاواتی گەلەکەم هاتەدی ٠

هەزاران سلاو لە گیانی پاکی ئەو شەهیدانـــەی سەرجەمی تەمەنیان کردە مەشخەلیك بو رووناك کردنـــەوەی تاریکایی ولات و سەرکەوتنی شورشی پیروزی گەلی کورد ٠

مـــردن و سەر شوری بو گشت جەللاد و پیاوکوژیـــك ٠

نامەی شەهید ئەنوەر محەمەد ئەمین قەرەداخی ناسراو بـە : هیوا
زووری خنکاندن لە نەینەوا
١٩٧٧/٨/٢٠

* هیچ جورە جولانەوەیەکی شورشگیری نی‌یە بـە بی تیوریکی شورشگیری •
* ئەو گەلەی ئامادەبیت قوربانی بدات و خاوەنی قوربانی‌یەکی زور بیت هەر سەرئەکەویت •
* شار و لادیکانمان کاول ئەکریت لە شـەری دریژخایاندا بەلام جوانتری دروست ئەکەینەوە •
* هەزاران سلاو لە گیانی شەهیدانی شـورشـی دریژ خایان •

بو هەریمی سلیمانی •••
سلاویکی شورشگیرانە
هاوریمان •••
لە زووری خنکاندنەوە داوای زیاتر هەول و تیکوشانو خوبەخت کردنتان لی دەکەم کە بتوانن زیرانە و چالاکانـە و دلیرانە بینە دەست روو بە رووی فاشست و خائینان و داگیر کەران ، وە داوا ئەکەم ئەو کەم و کوری یانەی دروست بـوون لە رابووردوودا بو ( ك • م • ل ) لە دەرەوە و لە ریکخراوە ـــ

کانی ناوەمدا بتوانن قەلاچۆیان بکەن و بۆ یەکجاری لــــە ناویان بەرن ، بە تایبەتی لە ناوبردنی ئەو خوفروشانــەی کە ئەگەرینەوە بۆ ناو میری و ئەبنە کوسپ و هەلدیری گــەورە گەورە.

" شەهید ئەنوەر لیرەدا بە دریژی چونیەتی گرتنــی خوی و جوری لیکولینەوەکەی لە هەلەبجە ، سلیمانی ، کەرکــوك مووسل ، ئەگیریتەوە کە پیویست بە نووسینەوە ناکات لە بــەر پاراستنی تهینی ریکخستن ... تا ئەگاتە ئەوەی ئەنووسیت "

ئەمە بوو کورتەی ئەو کارەساتەی کە بەسەر هــــاوری هیوا (( مەبەستی خویەتی )) هات هیوادارە کە دیراســە یەکی وردی بکەن و پرسیاری تەواو بکەن بو راستی ئــــە و مەبەستە ، چونکە هەمیشە سنگی فراوانە بو راستکردنەوەی هەلەکان و تا ئەو روژەی ملوانکەی فاشستەکان ئەکریتە ملی بو مــردن .

هیوا بەم شیوەیە روونی کردەوە تاوەکو هەمــــوو لا یەك ئاگادار بیت لە هەلەکانی ئەم و ئەو هەلانــەی کە هاوری یان و هەڤالان و برایانی تر کردوویانــە ود مرسیکی بەسوود بیت بو راستکردنەوەی هەمــــــوو ...رە لاری و چەوتی یەك کە لە رابوردوودا کــــراوە تاوەکو لە داهاتوودا دووبارە نەبیتەوە . هیــــوا زور پەداخەوەیە کە لە یەکەم هەنگاوی ریگای مارکسی لینینیدا بە گورجی ئەرویی و هەولی ئەدا کە زیاتــر بخوینیتەوە تاوەکو گەشە بدمین بە خومان بــەلام

بەداخەوە کە کەوتوتە ژێر داین و چرنوکی دوژمنەوە نەیهێشت ئەو خزمەتەی کە خوی نەخشەی کیشــا بوو بیباتە سەر ، بەلام ئەوەش بزانین ئەگەر بەهـــوی خائین (( ۰۰۰۰۰ )) نەبوایە هەرگیز هـــا وری هیوا بەر چرنووکی دوژمن نەئەکەوت ، ئەوا لـــەم نامەیەشدا کە چەند روژیك بەر لە سیدارە دانـــی نووسیویەتی ئەلی :

داوای لیبووردن ئەکەم لە گەلی کورد کە بــە دەست و دەمی خومان کەوتینە دەست دووژمن و بووە هوی وەستانمان لە خەبات و تیکوشان ، بەلام تا ئەو روژە و تا ئەو کاتەی ملم ئەکەن بە پەتا هەر ئەوەستم لە گەل هاوریکانم لـــــە ژووری ئیعدامدا هەر دژی فاشیستەکان و هەمیشە ورەمان بـــە رزە چونکە ئەزانین ژیان خوشە بەلام مردن لە پیناوی گەلدا لـــە ژیان خوشترە مردن خوشە بەمەرجیك ژیانیك لـــــە و مردنەدا دروست ببیت ، مردن لە پیناوی دروستکردنـــی ژیاندا ژیانە ، ئیمە نەشیدی نیشتمانی هەمە رەنگە ئەخوینیـن چونکە هیچمان لا نییە کە بیخوینینەوە و خوماتی پیوە خەریـك بکەین تەنیا نەشید و ورەی یەکتری بەرزکردنەوە نەبیت وە دەر کردنی هاوری یان دژی فاشستە بەعسیەکان و کـــردەوە چەپەلەکانیان ئەمەش چەند تیبینییەکە کە هاوری هیـــوا ئاواتە خوازە سوودی لی ببینین :ــ

١ ــ ژمارەی ئەو دیلانەی کە حوکمی ئیعدام دراوە بـــــە سەریاندا ئەمانەن بە گویرەی پەیوەندیان بە لایـــەنـــی

خویانەوە :ــ ك ۰ م ۰ ل زمارەیان ۱۳ کەسە کــــە
کە دوو ئەندامی هەریمی هەولیریان تیایە لــە گــە ل
دوو ئەندامی هەریمی سلیمانی و ئەندامیکی هەلەبجە و
ئەوانی تریش پیشمەرگەی یەکیتی نیشتمانی کە ژمارەیــا ن
( ۱۵ ) کەســن ، هەموویان پیشمەرگەن و زوریان ماوەکی
کەمە پیشمەرگایەتی یان کردووە و عەسکەری فیرارن ، بی
لایەن ( ۷ ) کەسن کە یارمەتی شورشیان داوە و توشی
زوووی ئیعدامیان کردون بە بیانوی درو و بە تالــــوە ،
الحرکە الدیمقراطیە الاشتراکیە ( ۱۰ ) کەسن کە هەمــوو
پیشمەرگەن . قیادە مەرکەزی ( ۲ ) کەسن و شەرد ووکیان
پیشمەرگەن ، رەنجدەران ( ۳ ) کەسن ، دووانیــــــا ن
دامەزرینەر و ئەوەکەی تریش پیشمەرگەیە ، شــــەهیـــــد
عەلی محەمەد شەریف ، کە ئیعدام کرا ( رمی بالرصاص )
بەراستی نموونەی ئازایەتی و دلیری تیا بوو ، وەشیرانە
رویشت بەرە و سەربازگەی دوژمن ، ئیمەش هەمــــــــوو
سلاو و هاوارمان ئەکرد ، ئەو بەیانیە کات ژمیری چوا ری
بەیانی بوو هیشتا نەنوستبووین ، ئەو شەوە زور لــــــــە
دانیشتوانی مووسل گوییان لە دەنگمان بوو .

۲ ــ لاوازی میری لەوەدا دەرئەکەویت کە ( ٦۳ ) کەس ئەسری
دراوە بە خنکاندن کە لەبەر روشنایی تیووری زانستــــی
هیچیان مافی خنکاندنیان نییە چونکە زوربەی بــــــە
شیوەیەك ئازارد راون کە دڕندەترین شیوەی نامروڤایەتیە .

۳ ــ بەعسیە فاشستەکان بیجگەلە شیوەی ئازاردانی لەشی و

د مرووئی ( جسد ی ونفسی ) ریگای فر و فیل و تعلەکـە بازی تریان بەکار هێناوە وەك ( وعد ) دانی بـە درو و بە سویند ی ئابینی و تەلاق خواردن و شتی تر تا لـــە ئەنجامدا (( ٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠ )) رووخا و تـــوروشـــی خیانەتیکی میژوویی بوو بەرامبەر بە گەل ٠

٤ ـ بەم خالانەی سەرەوە بوومان دەرئەکەوی کە ناتووانیـــن بریاری ترسنوکی بدەین بەسەر گیراوەکاندا بەتایبەتی کە زوربەیان جووتیاری بی تاوانی لادێی کوردستانن ، بەلکو بەپێچەوانە پالەوانی بەوە لە دەست ئەم درندەیـــە خوی هاویشتوتە بەر بەتی خنکاندن چونکە هەر دانی بە تاوانی خویدا ناوە ٠

٥ ـ لە گەل ئەمەشدا کە باسی ئەم خالانەم کرد پیویـــستــە ببینە سەر شوین و شیوەی بەرێوە بردن و لە ژووریکـــی ( ١٢ م/ ٢ ) دا کە زیاتر لە ٣٥ کەسیان تی ئاخنیوە کە بی بەشن لە هەوا وەرگرتن و هەموو شیوەیەکـــــــی تەندروستی ، ئەمەش بوتە هوی مردنی دەیەها کــەس لە ماوەی مانگیکدا ٣٥ ـ ٥٠ کەس ،نان ئەدران لــە ژیر سوندەدا بو ماوەی ٥ ـ ٩ دەقیقە ، چوون بـــو ئاودەست ( ٨٠ ) کەس بو ماوەی سەعات و نیویـــك ئەبوا یە تەواو بیت بە زور ٠

لە پاش ئەوەی کە حوکمی خنکاندن درا بە سەریاندا خرانە شوینیکی ٤٠ م٢ کە بزتی بوو لە ( ٣ ) سێ ژوور .

شوێنی خنکاندنی لە هۆڵێك بوو کە پەتەکەی بەرامبەرمان بوو ، ئەمیش هەر بە شێوەیەکی تەعزیبی پێش مردنە .

بۆ ئەوەی ڕووفی شۆڕشگێر بتوانێ خۆی لە مردن و هەڵە دوور بخاتەوە کە کەوتە دەست ئەم شۆفینییانە زۆر زۆر پێویستە دان بە خۆیدا بگرێت و بە هیچ شێوەیەك لەم شێوانەی سەرەوە کە باسمان کرد هەڵنەخەڵەتێ و نە ترسێ بە هیچ جۆرێك ئەگەر بیت لەت لەتیشی بکەن چونکە هەموو شتێکیان فڕ و فێڵە کە دەلالەت لە واقیعی دڕندایەتیان ئەداتەوە .

تێبینی

من لەگەڵ ئەو بڕوایەدام کە ئەگەر هەر خیانەتێك ڕوویدات با بچوکیش بیت ، خائین لە ناو ببرێت بە ڕوویەکی تیتر بۆ پێشەوە بەرە و سەرکەوتن لە ژێر ئالای سووری مارکسیزم ـ لینینیزم .

هاوڕێتان
هیوا

نامەی ژمارە ( ٢ )

شەهید : جەمالە رەش

بو هاوڕێی بەڕێز و تێکوشەر

سلاوێکی گەرمی شورشگێرانەت لی بێ .

هیوام خوشی و سەرکەوتنتانە . هیوادارم هەموو کاتێك بەرە و سەرکەوتن و بەرە و پێشەوە بڕون ..

١ ــ هاوڕێ .. ئەو ڕوژەی کە من هاتمەوە لە گەل(( ٠٠٠٠ )) ئیوارە بوو گەیشتینەلای شار بەلام بەنیسبەت منەوە زوو زوو بوو ڕویشتمە مالی ئەو کوڕەی ڕەفیقم وە ئەو نەیهێشت لەوی دەرچم . بەلام کە کەوتە ئیوارە چوو بوو خەبەری لی دابووم و لەوی گیرام . بەلام من هیچ مەجالـــم نەما و هیچم پی نەکرا و لە دوایی‌دا کە گرتمیان ... لە دوایی‌دا پاش سی ڕوژ دەستیان لە لیدانم هەل گرت .. . خاوەنی مالەکەیان لە گەلم لە سجن دانـــا وپی‌ی‌ئەوتم کە چی ئەزانم بیلیم بەلام من زوو زانیم کـــە ئەویان هیناوە لە گەلم بە ڕووخینی . پاش ( ١٦ ) شازدە ڕوژ لەوی هیچ ئیستیفادەیان لی نەکردم وە ئیعتیرافی (( ٠٠٠٠٠٠ )) لی بڕسیم و لە دواییدا بردمیان بـــو کەرکوك لە ٤ / ٩ / ١٩٧٧ وە بە گەیشتنی ئەوی لە ژیـــر ئازار و ئەشکەنجەی ئەواندا بووم تاکو ( ٢٢ / ١٠ ) وەلەوی چەند قسەیەکم لە سەر خوم کرد وە هەندی مەعلوماتـــم دەست کەوتبوو لە ئەمن ووتم ئەویش بە نیسبەت ( ٠٠٠ )

وە کە لای من بووە ٠ لە دواییدا مەحکەمە کرام و ئەمرم درا بە سێدارە دران ٠

وە زور پێ خوشحال بووم بەوەی کە لەسەر ڕێگای سەربەرزی و کوڵ نەدانە،واش ئەزانم کە گەلی ئێمە لە سەر خوینی شەهیدان بەرە و سەرکەوتن ئەچێت چونکە هەر ئیمەیی کە میری لە تەنزیمەکمان ئەترسی ٠ وەکو بوم دەرکەوتووە لەو پرسیارانەی کە لێ یان پرسیوم ٠ و منیش فەخر بەوەوە ئەکەم کە لە سەر ڕێبازێکی مارکسی ئیعدام ئەکرێم وە هەر ئەو ئیعترافەی کە لە سەر خوم کرد وە زور بە پێویستم ئەزانی کە من بمێنم بو ئەوەی کە چەند مەعلووماتێکم دەست کەوتووە بیگەیەنمە ئێوەی بەرێز چونکە زور بە پێویستم زانیوە ، چونکە ئەوەی لەگەڵیانا کردم لە توانای هەمو کەسێک نەبو ٠

٢ ــ هیوادارم کە بە وردی تاقیبیك لەوە بکەن وە من شکم بو ئەو کەسە ئەچێت کە چەند جارێك پێم ووتیت وە ئەبی ئاگاتان لێ بی و بوم دەرکەوتووە کە پیاوێکی باش نییە ٠

٣ ــ وە بە نیسبەت منەوە هیچ کەسێك نییە خاوەنی ماڵەکە نەبی ٠

٤ ــ هەندی هاوڕێم دیوە لە کەرکوك لە ژێر ئەشکەنجەی دروژمندا وە هاوڕێکەی خوشتن هەموو شتێکم پێ ووتوون لە بارەی ئێمەوە ٠

٥ ــ کە چوومە مووسل چەند هاوڕێیەکم دی هی خومان کە باسی ( مەلا مەحموود ) یان ئەکرد بە باشە و ئەمیان

ووت کە زۆر پالەوانانە و بە جۆرێک بە کۆمەڵە ئەزانێت و ئێمەسان ووت گوێ لێ بوو و ... ووتوویەتی چۆن لە سێدارە ئەدەریم بەڵام میللەت بە دوژمنم ئەزانێ ئینجا هاوڕێیان وەعدی ئێوەیان پێ دارە کە گوایە بە یەکێکی ئەزانین لە ڕیزی شەهیدانی کۆمەڵە وە بە ئینسانێکی تێکۆشەری گەلی کورد ئەزانین ، وە هەروەها ئێمەش هیوادارین کە هەڵا مەحموود بە هاوڕێیەکی کۆمەڵە بزانن چونکە بە ڕاستی پاڵەوانی خۆی نیشان داوە وە یەکێک بووە بە هەموو توانای خۆیەوە دژی دوژمن تێکۆشاوە .

٦ — بە نیسبەت ئەو هاوڕێیانەی کە ئەچنە بەر پەتی سێدارە بە تەشەید و هوتافی نیشتمانی و مارکسیەوە ئەسە ڕوون بەرە و پەت ، وە بە نیسبەت دوژمنەکانمانەوە دەبێ لێمان تێبگەن کە قسە ئەکەین و هوتاف و نەشید ئەڵێین بەڵام هیچ شتێک نییە تەئسیر بکاتە سەر ئێمە و تاکو پەتەکە ئەکەن بە ملماندا هەر لە قسەی خۆمان ناکەوین وە جەللادەکان دەڵێن لەوەتی ئێمە لێرەین شتی وەکو ئێوەمان نەدیوە ، وەئەوانەی لە سێدارە دراون .

٧ — هاوڕێ گیان ئەوا ناوی ئەو شەهیدانەم بۆ ناردن کە لە مانگی ٨/ ٨/ ١٩٧٧ تا ١/ ١١ لە سێدارە دراون و چەند کەسێکی کە کەلە دیوارەکە نووسرا بوو باقی ئەسە و کەسانەی کە ماوین ئێستا ئێمە ( ٣٥ ) کەسین لە ژووری ئیعدام ماوین وە هەر ڕۆژە بەرە بەرە لێمان ئەڕوات وەکو گورگ چۆن لە ڕانە مەڕ ئەدات ، جاری یەکێک یەسمان

دروان ئەبات وە شەوی وا بووە (٧) کەسیان بە یەکجار ئیعدام کردووە .لەو شەوانە (٩٣) کەسیان لە ابو غریب ئیعدام کردووە •

٨ ــ سلاو و ریزم هەیە بو هەموو هاوری یانم یەك یەك ...
سلا و و ریزم بگەیەنن بەو کەسانەی کە ئەمناسن لە ناوچەکەدا • داوای ئەوەتان لی ئەکەم کە لیم ببوورن چونکە نەم توانی بەتەواوی هاوبەشی خەباتی تەواوی گەلەکەم بکەم و لە ریگای شەریکدا شەهید بکریم • ئەوسا زور پی خوشحال دەبووم چونکە من تاکو ئیستا هیچم بو نەتەوەکەم و بو رزگاری کرد نی کورد و کوردستان نەکردووە وە بتووانم بە تەواوی خەباتیکی شورشگیرانە بکەم وەکو ئینسانیکی راستەقینەی مارکسی ــ لینینیی • هاوری یان ئەو کەسانەی کە دینە ئیرە هەموو ئیمان بە مارکسییەت ئەهینن و ئەلین خوزگە لە پیشتر تی ئەگەیشتین • لە کوتایی نامەکەدا هیوام سەرکەوتن و رزگاری کوردستان و کومەلەمانە ..
هیوادارم هەر سەرکەوتوو بن •
ئیتر خوشیتان ئاواتمە •

هاوری تان
نەبەز
١٩٧٧/١١/١

نامەی ژمارە ( ٣ )

شەهید : جەمالە رەش ((جمال شیخ علی مارف))

هاوری جەمال بەر لەوەی لە سیدارە بدریت ، هەر چەند هەلیکی بو هەلکەوتبیت بە نامە پەیوەندی لە گەل هاوری کانی کرد وتەوە و لە ویشەوە هەر هاوریکانی هان داوە بو خەبات و لیسەر رویشتنی ریبازی کومەلە ، لە نامەیەکدا کە بو هاوریی (( ٠٠٠٠٠ )) نووسیویەتی ئەلی :

کوردستان یا نەمان

هاوریی بەریز و شورشگیرم کاك (( ٠٠٠٠٠ )) پیشکەشە سلاویکی شورشگیرانەت ئاراستە ئەکەم ، هیوام خوشی گوزەرانیتە ، ئاواتم سەرکەوتنی ئیوە و شورشە پیروزە نویکەمانە کە بە بیر و بروایەکی مارکسی پەروەردە بکریت و سەرکەوتوو بیت .

کاکە گیان ٠٠٠من زور باشم ، باشی ئیوە هەموو شتیکە و منیش سەرکەوتووتر ئەبم ، ئیستا خوم بە بەختیار ئەزانم کە لە ریگای کورد و کوردستاندا لە سیدارە ئەدریم و پیم ناخوش نییە ، بەلکو شانازی پیوە ئەکەم ، لە ئەوەل روژەوە ئەم ریگا پیروزەم بو خوم هەلبژاردووە ، لە پیش هەموو شتیکەوە دیاریم کرد بوو ، ئینسان لە نەتیجەی ئیش کرد نەوە تووشی هەندی هەلە ئەبیت ، بەلام الحمد لله لە دوای هەموو شتیك دووژمنە فاشستەکان هیچ ئیستیفادەیان لە من نەکرد ، من ئیستیفادەم لەوان کرد و گەیاندوومە بە جیی خوی ،ئیستا

خوم به روله‌ی میلله‌تی کورد، ئه‌زانم ، چونکه دایك و باوکـــی ئیمه خاوه‌نمان بین ، میلله‌تی کورد و خاکی کوردســـتان خاوه‌نی ئیمه‌ن ئیستاش پیویستیان بی‌یه‌تی که ئیمه خومـــان له پیناویا به‌خت بکه‌ین بو رزگاری گه‌ل و نیشتمانه‌که‌مان :

داری ئازادی به‌خوین ئاو نه‌دری قه‌ت به‌ر ناگری
سه‌ربه‌خویی بی فیداکاری ئه‌به‌د سه‌ر ناگری

منیش و ئه‌و هاوری یانه خومان ئه‌که‌ینه سووته‌مه‌نی بـــو شورشه پیروزه‌که‌مان ... ئه‌و که‌سانه‌ی که ئیعدام ئه‌کریـــن هه‌موو به ده‌ستی کورد ، خائینه‌کان تووش بوون و هیـــــچ که‌سیك دووژمن نه‌ی گرتوون ، هیوادارم که ئاگاتان لـــــه و که‌سانه بیت و ئاگاتان له خوتان بیت ، هه‌روه‌ها به راستـی روله‌ی ئازا و نه‌به‌ز مان هه‌یه و ئه‌و که‌سانه‌ی که لیره شه‌هید ئه‌بن زور جی‌ی شانازی و فه‌خره که ئیمه شه‌هیدی وامـــان هه‌ـــیه .

له کوتاییدا ئاواتم سه‌رکه‌وتنی شورشه پیروزه نـــوی یه‌که‌مانه به رابه‌رایه‌تی چینی کریکار و فه‌لاح و دلسوزه‌کانـی . سلاو و ریزم بگه‌یه‌نه به هه‌موو پیشمه‌رگه و هاوری یان .. هیوا دارم که لیم ببووری ئه‌گه‌ر روژیك دلت عاجز بو بیت لیم ...

بژی کومه‌له‌ی مارکسی ـ لینینی
بژی شورشه پیروزه‌که‌مان
بژی یه‌کیتی نیشتمانی

برات
جه‌ماله ره‌ش

جەمالە ڕەشی قارەمان پێش خنکاندنی بە ماوەیەکی کەم وەسیەتنامەیەکی بۆ کەس و کاری نووسیوە کە پێش ئەوەی ئێمە چاپی بکەین ، خەڵکی خۆیان بە دەست خەت بلاویان کردوتەوە کە لێرەدا بێ لەسەر نووسین و لە سەر دوان دەقا و دەق وەکو خۆی بێ دەسکاری ( جگەلە هێ ئیملایی ) بلاوی ئەکەینەوە کە بە ڕاستی بەلگە نامەی قارەمانەتییە

وەسیەت نامە

بێ ی ناوی بۆ شەهید ی وەتەن شیوەن و گریین
نامرن ئەوانە وا لە دلی میللەتا ئەژیـــن

هەزاران سلاو لە گیانی شەهیدە نەمرەکانی شورشی کـــورد و شورشگیر ئازادی خوازەکانی جیهان .

بۆ دایکی خوشەویستم ، باوکی بەڕێزم ، هەموو کەس و کارەکانم ، هاوڕێکانم .

باوک و دایکی خوشەویستم :

ڕەنگە پرسیار بکەن و بلێن بوولە بو وات لە خوت کرد و ئەمەشت بەم دەردە برد ؟

بابە گیان ... دایە گیان :
لە بیرتانە چەندین جار باسی لە ناو چوون و نەمانی خۆمم بۆ ئەکردن ، لەم ریگە پیروزەدا ، لە پیناوی ئەم خاك و گەلەدا ، ئیستاش وا ئەزانن من لە ناو چووم ، نەك مـــــن و هاوری شەهید ەکانم هەرگیز نامرین ، ئیمە بووینەتە سووتـــــەمەنی بۆ شورشە پیروز و نوئییەکمان ، کوردستان تینویەتی و تینویەتی خاکیش بە خوین نەبیت ناشکی ..

ئەمرۆ کە خاکی پیروز و میللەتەکمان لە مەترسی تواندنەوە و نەمان دایە ناکری بلیین :
( کورم دەس بە کلاوی خوتەوە بگرە . )
نەء دایە و نەء بابە گیان ، چونکە ئەو رولانەی کە خوینیـــــان رژاوە بەسەر خاکی کوردستان دا و لە سیدارە دراون هیچیان لە کورەکەی تۆ کەمتر نەبوون ، ئەوانیش هەموو دایك و کـــەسو کاریان هەبوو ، بەلام لەگەل ئەوەشدا بەویەری شانازی یـــــەوە خۆیان بەخت کرد لە ریگای رزگاری و ئازادی گەلەکەیانـــدا .
بابـــە گیان :
کاتیك ئەم ریگایەم هەلبژارد بوخوم زور باش ئەمزانی ئــــەم ریگایە سەخت و پر لە هەلدیر و نشیو ، پر لە تەنگ و چەلەمەیە ، بەلام لەگەل ئەوەشدا چاك ئەزانم سەرکەوتنمان راستیەکەو لە دەستایە ، چونکە گەلەکەمان ، ریگەی راستی ( م.ل ) ی هەلبژاردووە و شورشی تازەی بەرپا کردووە ، ئیمە تووەمـــــان چاندووە و رەگی داکوتاوە لە خاکماندا ، زور باش ئەزانــــــم چیمان چاندووە و چیش ئەدرووینەوە .

بابه گیان ، دایه گیان :

گوی رابگرن له قسهکانم وهك دایك و باوكی كوریكی شورشگیـــر ، زور جیی شانازی یه بوسن كه گهلهكه م وهرم بگریت وهك شههید . یكی حوی ، داوای لیبوورد نیش‌له گهلهكهم ئهكه م كه نهمتوانی لهوه زیاتر خزمهتی بكهم . كه نهمتوانی ئهو نهخشهیهی كیشا بووم بو تیكوشان تهواوی كهم ، بهتی حنكاندنی نا شستهكان نههیشت ئهو نهخشهیه تهواو كهم . بویه لیرهدا مـــــــن و هاوری شههیدهكانم له ریی وزگاری كورد ستاندا حومـــان ئهكهینه سووتهمنی بو بهرزی مهشخهلی شورشه پیروزهكهمـــان بـــوبه ئهلیم :

شههیدین و كاروانیش نه رهوتـــایه
سهربهرزین و مهشخهلمان ههر له گهردایـــه
رولهكانمان ئاوا ئازان بویه ئهلین
ســـهركهوتنمان راستی یهكه و له دهستدایه

دایه گیان ، بابه گیان

ئهی خوشك و برا و هاوری خوشهویستهكانم :
راسته ئهلین ژیان خوشه ، بهلام ئایا ئهزانن لهوه خوشتـــر خوبهختكردنه له پیناوی میللهتدا ، مروفیك ژیان لــه دوای خوی دروست بكات مردن نییه ژیانه ، ژیان له مردنی ئهمروی ئیمهدا بو نهوهی داهاتوو دروست ئهبی .

دایه گیان :
رولهی خهلك به رولهی خوت بزانه ، ئهوهش بزانه من بـــه

تەنها رۆڵەی ئێوە نیم بەڵکو رۆڵەی هەموو گەلی کوردم ، بڕوا شـم بە گەلەکەم هەیە کە دوای من سەرکەوی بەسەر دووژمنە خوێن ریژ و خوێن مژو داگیر کەرەکەیدا .

هەندێ ئامۆژگاریم هەیە بۆتان و بۆ خزم و برایانی خۆشەویستم ، بۆ خوشکەکانم :

١ ـ بە هیچ جۆرێك دڵی هاوڕێکانم نە یەشێنن ، قسـوول لێکی بدەنەوە و حیسابیان بۆ بکەن ، دووریەن بـسن و حسابی کوڕتیان بۆ مەکەن ، من زۆر باشیان ئەناسم بـە هیوام ئیوەش هەر وابن ، هیوادارم چوون سەیری مـن تان ئەکرد هەرواش سەیری کاك (( . . . . . )) بکـەن چونکە زۆر خۆشەویستی منە .. هیچ جیاوازی لە گـەل مندا نییە .

هاوڕێکانی تریشم وەك کاك (( . . . . . )) چونکـە ئەویش خۆشەویستی منە .. هیوادارم باقی هاوڕێکانـی ترم لە خۆتان جیانەکەنەوە .

٢ ـ جلی رەشم بۆ نەکەن و سەربەرز و روو سوور لەنـــا و خەلکدا خۆتان دەرخەن ، شین و شیوەن و شەهیـــوور گریان و پەخەی دادزین من ناگێڕنەوە ، رانیم تییە لـە مردنی خەلکی تردا ئێوە دەبسان شین و گریان دامەزرێننەوە ، ئەمەیت هەموو ساڵێك یادم بکەنەوە ، لەوڕۆژەی کە تییدا ئەدرێم لە سێدارە ، یادکردنەوەش بەشیـن و گریان نا بەڵکو ئەگەر بۆتان کرا بە گشتی بەرگی سـوور لە بەر کەن ، خۆتان برازێننەوە و سروودی نیشتمانیـم

بو بلین ، سروود بك جعرئی داگیر کەران بخاتـــە لەرزە ، بەلام بە مەرجیك ئەو یاد و ئاهەنگە ترمیسکـــی تیا نەرژێ •

٣ ـ هیوادارم کە ئاگاتان لە گولزار و شاناز و قالە بیـــت چونکە زور حەزم ئەکرد نازی ئەو سیاتە هەلگرم و خزمەتیان بکەم • هیوادارم کە بی دلیان نەکەن •بە تیسبـــەت قادر و شانازەوە مەکتەبیان بی تەواو بکەن • ئاموژگاریان بکەن کە ئەبی زور باش بن • بە تیسبەت گولزارەوە هەر کاتیك وەختی بە شودانی هات بیدەن بە کوریکـــی زور باش بەمەرجی خوی رازی لە سەر بیت •

٤ ــ هیوادارم کە ئاگاتان لە مالی عوسمانی مامم بیت و ئاگاتان لە مندالەکانی بیت و بەتایبەتی مستەفا -چونکە حەز ئەکەم هەر بخوینی تا خویندنەکەی تەواو ئەکات • تکاتان لـــی ئەکەم بە تایبەتی خوشك و برا و خزم و پورەکانم •خالـــم، کورە مامەکەم ، پورزاکانم • هەموو خزم و کەس و کارەکانـــم هاوری بە ترخەکانم • تکاتان لی ئەکەم کە لیم ببوورن و گەردنم ئازاکەن چونکە بە راستی زور ئـــازارم داون و تووشی دەرد مسەریم کردوون تا منتان کردووە بـــەم پیشمەرگەیە لە لەشکری سووری کوردستانا • هیـــوادارم هەمووتان لیم خوش بن .

دایك و باوکە خوشەویستەکەم :

هەولیك بدەن بو ئەوەی تەرمەکەم وەربگرنەوە • هەرچەند ئەی زانم ئەو دڕندانە رازی نابن ، ئەم فاشیستانە ئیمەیـــان

خزاندوته ئەم زووره تەسكانەوه و بە دزی یەوه لە سیداره مان ئەدەن ، تا ئیستا ( ١٦ ) قارەمانم دیوه کە لە سیدارەیان داون ، بە راستی ناتوانم باسی قارەمانیتی ئەو دلیرانە بکەم کە چون شیرانە رووە و پەتی سیداره ملیان ئەنا ، کە چون شەرمەزاری سەر شوری یان ئەخستە دلی دووژمنی فاشیستەوه بە راد ەیەك سەریان سوور ئەما لە ئازایەتی و قارەمانیتی رولەکانی گەلی کورد بەراد ەیەك پاسەوانە بەکری گیراوەکان ئەیان ووت : حەیف بو ئەو رولە نەبەز و تیگەیشتوانە جا ئەگەر تەرمەکەیشیان دانەوه ئەوا لای گوری شەهید ( شەهاب ) وه بم نیژن ، خوئەگەر نەشیان دانەوه ئەوا هیچ بی ی ناوی دلگران بن چونکە یادگارم زوره لە مالەوه و هەر یەکەیان جمالیکە بو ئیوه .

خوشەویستەکانم :

زور باش بزانن کە میری دووژمن زوریاش شکاوه و هیزی لە بەر براوه بویە لە مانگی ( ٨ ) وه دەستی کردووه بە خنکاندنی هاوریکانمان لیره ( موسل ) و لە بەغدا ( ابو غریب ) تاکو ئیستا ( ٥٥ ) قارەمانمان لە سیداره دراون ، ئەگەر یەکیك ئیستا ئاگاداری ئیمە بووایە و چاوی لەو پلینگانە بوایە کە چون وا بە پیکەنین و هوتافەوه روو بە رووی مەرگ ئەچن ، حەزی ئەکرد بەشداری ئەو ئاهەنگەی بکردایە • زورم حەسەز ئەکرد لە گەل ئەو ( ١٢ ) قارەمانەدا بوومایە کە بەم نزیکانە لە سیداره دران و لە گەل ئەوان پەتی خنکاندنم لە مل بکردایە ، بەو پەری شانازی یەوه ئەلیم ، زور جیگای شانازی و سەر بەرزی یە بو من کە گەلەکەم وەك شەهیدیکی خوی

وەرم بگریت بویە ئەلیم :
شەهیدین و کاروانمان لە رەوتـایە
سەربەرزین و مەشخەڵمان هەر لە گەردایـە

دایـە گیان :
ئەو شتانەی کە هەمە وەکو رەسم و کتیبەکانم هەڵـگرن و رەسمەکانم بخەنە ئەلبوومەوە بو یادگار با بمینی ، هیوا دارم کە زور ریز لەو هاوری خوشەویستانەم بگرن چونکـە زور خوشەویستن لای من ٠زور ریز لە (( ٠٠٠٠٠ )) و (( ٠٠٠ )) و (( ٠٠٠٠٠ )) بگرن چونکە زور هیلاك بوون لە گەلمـا وە بەتایبەتی مالی (( ٠٠٠٠٠ )) هیوام وایە لە خوای گـەورە کە تو و باوکم بچن بو حەج و چاوەروانی ئەوەنەکەن بلیـن جەمال رویشتووە ٠

داواتان لی ئەکەم بە زووترین کات ژن بو (( ٠٠٠٠٠ )) بهینن ، بەراستی من زور قەرزاری ئیوەم هی هەمووتـان ، ئیوە لە خوشی خوتان هەلگرتووە و خستووتانەتە سەر مـن بو ئەوەی لە خوشیا بم و رزگارم کەن ، بەلام بەداخەوە چونکە ئەمزانی کە ناتووانم لە چنگی ئەم دووژمنە پیسە رزگارم کـەن بویە هەموو جاری پیم ئەوتن کە خوتان ئازار مەدەن و پارەی بەلا ش خەرج مەکەن ٠٠من ئەروم ٠٠رویشتنەکە ئیـوە ش ئەتووانن شانازی پیوە بکەن ، ژیانم هیچ خوشی نییە پـاش هاوری قارەمانەکانم ، تەنها ئەوەم لا خوشە کە منیـش وەك ئەوان بووم و بەشداری کاروانی شەهیدانی ریگەی شورشـە نوی یەکمانم کرد ٠

ئەم پارچەهۆنراوەیە پیشکەش بە برا و خوشك و هاوڕێ
کانم ، بە کوڕیە نازدارەکانیان ، هیوادارم پێ یان لــــە
بــنعر کـــەن :
لە جەژنا شادی و گرمەی دەروونم
تیکەلاو ئەبێ پەیمانی روونم
ئەنیرم بۆ تۆ و بۆ کوردســـتانـــم
بۆ تۆ بژەی لیو بۆ ئەویش گیانم

ئەم پارچە هەلبەستەی خوارەوە هەلقولاوی پشتـــی
شیشە رەشە پولاییەکەی دەرگای زوورە تەسکەکانی رەدهــەی
ئیعدامن ، پیشکەش بە مندالەکانی ئەکەم و ئەمەویت لـــە
بەریکەن و یادی منی پێ بکەنەوە :
کریکاریکی کوردی جەسوورم   خەباتکەریکی لەشکری سـووروم
دەربەدەریکی هەژاری کوردم   پیشرەوی چینم بۆیە وا گورجم
شورشگیری یە ریبازو بیـــرم   کیوی حەمرینە هیلی سنوورم
ئەمن پیشمەرگەی خەباتی دوورم هەرگیز لانادەم بۆ هیوای سورم

٥ ــ دایك و باوکە خوشەویستەکەم :
دووبارەی ئەکەمەوە و داواتان لێ ئەکەم کە هەمووتان و
خوشك و برا و ئاموزا و پوور و براژنم و خالوژنم هــەمو و
لایەکتان دوست و ریك و ئاشت بن ، هەموو یەکترتــان
خوش بویت .
ماموستای مەزن لینین ئەلیت : ئەگەر ئەتەوی ئەو کەسانــە
بناسیت کە ( م.ل ) ی راستن لەناو مال و کەس و کاریدا
سەیریان بکە .. ئەگەر لەگەل ئەوان ریك بوو ئەوا ئەتوانی

کسانی تریش ریك بخات ، جا من ئه م نمونمیه م لصه ر خوم هینا یموه که بمو شیومیه نمبووم بملام همر بمو هیوا یه بووم که وا بم ، وه ئمبووم ئمگمر وا نمبووایه ، خوتان زور چاك ئمزانن که رقم له ئاژاومیه ، هەرگیز ریگا نمدەنکـــه بیته ناوتانەوه ، هیوادارم کمسیو کارمکانم ،گموره و بچوك لمسمر ئمو ریگایه برون که منی لصمر بووم چونکه تاکـــــه ریگایه بو رزگاری گملەکه مان و پاشەروژی روناکی لـــــــه دوایه .

دوای من به هیچ شیومیمك تیك نه چن ، روو سوورروسمر بمرز لمناو خملکا خوتان نیشان بدەن ، شیرانمیی ئموەی چاومکانتان به فرمیسکموه بیت چونکه من شمهید م و بسو شمهیدانی ومتەن پی ی ناوی شیوەن و گرین ، داواتان لی ئمکه م ژیرانه بیر بکەنموه ، هعقی عوسمان نافموتی ، زور سوپاسی هه موو ئمو کمسانه ئمکه م که هاتبوون بسو مواجه هه بو لام ، زور سوپاسی ئمو کمسانه ئەکه م کـــه دین بو تەعزی که م ، تکام وایه هیچ لمو کمسانه ئمگر ن که نمهاتن بو لام بو مواجمهه یان ناویرن بین بــــــــو تەعزی که م . من خوم داوه به خنکاندن بو ئموەیبتوانم کسانی تر بپاریزم ، زور خوم به بمختیار ئەزانم که توانیم هاوریکانم له خنکاندن بپاریزم و بمسمر خومدا زال بووبو گیانی هاوریکانم بپاریزم ، هیوام وایه ئیوه شیرووکــه ش سمیر مەکه ن ، بملکو دالیکتیکی کارمساتی من لیك بدەـ نموه ، به قسەی کمسانی رووخاویش نالوز مەبن ، مـــــن راستم لمسمر راستترین ریگاشم ، ریگەی راستی ( م.ل)ی

ئیمەش دەست ئەکەین بە هوتاف کیشان و خوا حافیزی کردن ، هەموو هاوار ئەکەین و ئەلیین :

" تقدموا یا ابطال و نحن من ورائکم "

وە لەو کاتەدا لە مەشنەقە بەرئەد رینەوە ئەلیین :

هذه اعمالکم یا فاشیة ، هذه اعمالکم یا جبناء"

تاکو چەند دەقیقەیەك ئەم هوتافە دووبارە ئەکەینەوەو ئەلیین :

داری ئازادی بە خوین ئاو ئەدری قەت بەرناگری
سەربەخویی بی فیداکاری ئەبەد بەسەر نـاگری

فیتر خواتان لەگەل .

بو پیشەوە لە ژیر ئالای سووری شورشە نوی یەکە ماندا

کوری شەهیدتان
جەماله رەش

((کە جەللادەکان ئاگاداری کەس و کاری هاوری ( جەمال ) یان کرد بچن بو دوا دیداری تورمەکەیان لە زیندانی موسل ، سەدان کەس لەگەل دایك و باوکی جەمال چوون بو سەردانی جەمال لە قەسابخانەکەی موسل ، هاوری جەمال لەوی لەو چەند دەقیقەکەسەدا تکای لە هەموویان کرد کە بو ئەوەی دوژمن پی یان خوش نەبیت کەس نەگری و فرمیسك نەریژی بەلکو دەس بگرن و بیکەن بە هەلپەرکی و سروود وتن .

شەهید جامید حەمە ئەمین کە خوی شایەتی لە سیدا-

رەدانی جە ماڵە رەش بووە لە نامەیەکدا نوسیویەتی :

جە ماڵە رەشویتی : جەنابی مود یر کە ئیمە موجرییمیـن و موستەحەقی ئیعدامین بوچی نامان بەنە سەر شە قامەکانـی موسل و لەبەر چاوی عالەم جار بدەن کە خەلك ئەکەین بەدارا بو ئەوەی کورد وعەرەب دەرس وەربگرن و کەس بەغلەتا نەروات بەلام درو ئەکەن ، تەنها مەبەستتان ئیبادەکردنی میللەتـی کوردە بویە لەم کونەدا ئیعدامان ئەکەن ، ئینجا وتبـو ی بژی کومەلەی مارکسی لینینی و یەکێتی نیشتمانی کوردستان وە بە ئەی رەقیب روبەشتە بەر پەتەکە و کچانی سلیمانی دەوریکی باشیان بینی لەگەل منالەکانیان بە سروودی ئەی رەقیـب و زەی جەباتمان و ... جەبات بە بکەین . ئینجا لەبەر دەرکی زیندانەکە رەشبەلەك و شایان کرد و خوا نەکا یەکیك فرمیسـك بریژی ، جە ماڵە رەشئەیوت " یا " . ئەوانیش ئەیسـان وت ( یەعنی سجنەکان ) : یعیش .

بەم جورە دلی هاوریی قارەمانمان ، جە مال علی مارف لە نیوەشەوی ۲۸ / ۱ / ۱۹۷۸ لە نیدان کەوت بـــە دەستی جەللادە خوین ریژەکانی عیراق . بە راستی هاوری جە ماڵە رەش بەو بەری قارەمانەتیەوە بە گیانی خوی پاریزگاری شەرەفی ئەندامیتی کومەلەی کرد و شایستەی ناوی " نەبەز " بوو کە لە کومەلەدا لی ی نرابوو * )) .

* بروانە "کومەلە" ژمارە ( ۱ ) لاپەرە "۲۱" زستانی ۱۹۷۸

نامەی ژمارە ((١٥))

شەهید : ئاشتی ( ابوبکر نوری قادر )

بو کومیتەی شاری سلیمانی

سلاویکی شورشگیرانە

هاوری یانی خوشەویست

گەرمترین سلاوتان پیشکەش بیت کە هەلقولا بیت لە ناخی زووری خنکاندنی بە عسی فاشیستەوە کە هاند مریك بیت بــــو سوور بوون لەسەر ریگەی راستی مارکسی ـ لینینی ، تە نــــها داواکاریمان سووربوونتانە لەسەر خەبات کردن و کول نــەدان هەتا هینانەدی ئاوات و ئامانجی چەوساوە و رەش و رووتــی میللەتەکەمان بە رابەری چینی پرولیتاری کورد •

هاوری یان :

هەروەك ئاشکرایە هەتا ریگای خەبات سەخت و پرقوربانی بیت دوژمن بە دەیان لاو بەند یخانەکان پر نەکات لـــــەە شورشگیران ، شورشی سوور ، لافاوی خوین ، دوژمنا ــــی کوردی تیا نەخنکیت ئازادی وەرناگیریت ، ئەگەر ئیمـــــە ش ئامادەی ئە مە بین سەرکەوتن زوو بە دەست ئەهینین ، ئە بـی هە موو شورشگیریك ئە مەی لە پیش چاو بیت :

كە سەربەستی ئەسینریت ناد ریت •

کە ژیان بەخیت کردن لە پیناوی بیر و باوەردا هە میشــە پیشەی پیشمەرگەی هیزی سوور بووە ، بەلای منەوە بە بیـــــر و باوەرم ، سەربەستی : ژیانە ، ژیان : تیکوشانە •

من حەزم ئەکرد کە نەگیریم بو ئەوەی هەر ئیش بکەم بـــو بیر و باوەرەکەم ئیستاش کە گیراوم و بریاری خنکاندنم دراوەزوو شانازی پیوە نەکەم . شانازی بەپەتی خنکاندن ئەکەم چونکـە هەمان پەت خراوەتە ملی شەهیدان شەهاب و جەعفـــەر و ئەنوەر و سەدان لاوی شورشگیری کوردی تر .

بەلای منەوە گیرانم دەستی کەسانی تری تیابوو بەلام کین؟ من هەر ئەوەی کە بیزانم بوتان ئەنوسم و ئیوەی خوشەویست لــە لای خوتانەوە پیویستە لیکولینەوەی تیا بکەن ، نەك لەبەر من ، بو ئەوەی کەمسر تر خیانەت نەکات .

## پ . م ئاشتی *

---

* تیبینی : نامەکەی شەهید ئاشتی زور لەوە دریژ ترە بەلام سەبارەت بەهەندی هوی تایبەتی و سیاسی لە هـــەلو مەرجیکی وەك ئەمرودا هەر ئەوەندەی بلاود،کریتـــەوە . نامەی دووەمیشی کە بریتی یە لە پەیوەندی نیوان خوی و ریکخستن ئەویش لەبار و دوخی ئەمرودا بو بلاوکردنەوە دەست نادات .

نامەی ژمارە (( ٦ ))
شەهید: ئاشتی
کومەڵەی مارکسی ــ لینینی کوردستان
بو کومیتەی شاری سلیمانــی ۰۰

هاوری یان ، گەرمترین سلاوی شورشگیریتان پیشکــە ش بیت ، هیوا و ئاواتم سەرکەوتنتان و بەدی هینانی ئامانــج و ئاواتی میللەتە رەش و رووتەکە مانە ، لەم کاتەدا کە ئـــەم نوسراوە بو ئیوەی بەریز ئەنوسم بریاری خنکاندنم دەرچــووە ، لەگەل ( ١٥ ) کەسی تردا سەعات ــ ١٢ ــ ی شــــەو هەلـــــدەواسرێین و تەنها نزیکەی ( ١٠ ) سەعاتمــا ن ماوە ، بەراستی ناوەروکی نامەکەتان جیگەی شانازی و ســەر بەرزی ئیمەی بەندانی زووری خنکاندن بوو ، بەراســـتی نیشانتان دا کە کومەلە هەمیشە هاوری یانی خوی لە یــا د ناکات و هەر بە بیر و باوەر لە گەلیان ئەژی و ئامادەی هەموو کاریکی جوامیرانەیە بو هاوریکانی خوی ۰

حەز ئەکەم ئیستا جوابی نامەکەتان بدەمەوە :

١ ــ ۰۰۰۰۰۰۰۰۰۰۰۰۰

٢ ــ هەروەها نازانم کە چون سوپاسی " ۰۰۰۰۰ " بکــەم ۰ ئایا تەنها وشەی سوپاس جیگای ئەو هەموو هەستـــە بەرزەی ئیوە دەگریت ۰۰ بە شانازی یەوە دەلیم کە من لە خیزانیکی هەژاردا پیگەیشتووم و گوشکراوم ۰ من پیــش ئەوەی مارکسیەت بزانم یان بویان باسکرد بم من هەمو و

ژیانم هەروەکو مرۆڤێکی مارکسی وا بووە. چونکە ئەو بسارەی
کە منی تیا پەروەردە بووم هاتەمر بوورە . بو ئەوەی مارکسیا-
نە بیر بکەمەوە چونکە مارکسیەت بناغەی بارێئا بووری یە و
هەر ئەمەشە راستی ی باوەری مارکسی مەزن منی کـــردە
ئەو پێشمەرگەیەی کە لە شۆرشی سووری ئە مجارەمانـــدا
بەشداری بکەم و بچمە ریزی خەباتگێرانی کۆمەڵەوە لـــە
پێناوی خەباتی سەخت و پڕ شانازی کۆمەڵەدا خۆم گسوش
کەم ، نە مری بو باوەری پاکی کۆمەڵە .

٣ ـ پیرۆزبایی سەرکەوتنەکانی پێشمەرگە ئازە مانەکان ئەکەم ،
هیوام وایە کە چوکی کرنووش بە دوژمنی گەلەکەمان دادەن
وە بانی هەزاران ساڵەی رەش و دووتی گەلەکەمان بپسێنن .

٤ ـ گەورەترین پیرۆزبایی لە بەستنی کونگرەسی یەکەمتـــان
دەکەم و سەرکەوتنی بو دەخوازم . هیوام وایە هەولـــی
بەدی هێنانی پارتی پێشڕەو بدرێت . ئەمەش لە گۆری
خەباتدا دێتە کایەوە نەک بە قسەکردن و شت نووســـین
بەڵکو بەوەی کە خوتان فال بکەن . زیاتر بچنە ناو ریزی
هەزارانی گەلەکەمانەوە . هەتاکو ئاواتی هەرە بـــەرزی
شەهیدان بهێننە دی کە دروستکردنی پارتی پێشڕەوە ،
هەزاران چەپکە گوڵی سوور پێشکەشە بە بەستنی یەکـــەم
کونگرەی کۆمەڵە بێت .

٥ ـ بەراستی حەزم دەکرد ریزی ئەوە بە خۆمەوە ببینم کـــە
کۆمەڵە سەرکەوتنی بەدەست بهێنایە و بو یەك چرکە بژیاما
ئیتر چی دەمبوو ببوایە .

٦ ـ ئەمیش ئەو ئاواتەیە کە تازە ئیعدام کراون وا بوتانـــی

ئه‌نجوم ٠

١ ـ حامد حه مه ئه مین / پاخسه بەر / كومـەڵـه ی
رەنجده ڕانی كورد ستان ٠
٢ ـ علی احمد عزیز / گاپیلون ٠
٣ ـ فائق مصطفی / مالومه / شیت بوو
٤ ـ ئازاد صالح / سلیمانی / ی ٠ ن ٠ ك
٥ ـ طه محمد توفیق / سلیمانی / ی ٠ ن ٠ ك
٦ ـ نصرالدین صالح / سلیمانی / ی ٠ ن ٠ ك
٧ ـ جلال رشید / پینجوین / ی ٠ ن ٠ك
٨ ـ نادرعلی / هەولیر / ی ٠ ن ٠ ك
٩ ـ صباح زاهیر / هەولیر / ی ٠ ن ٠ ك
١٠ ـ عمر طه علی / هەولیر / ی ٠ ن ٠ ك
١١ ـ صابر حسین / شارەزور / پ ٠ م له كەرتـــی
قەرەداغ
١٢ ـ جعفر اسود / كویه / ی ٠ ن ٠ ك
١٣ ـ سید كمال سید واحد / كویه / ی ٠ ن ٠ ك
١٤ ـ سید جواد كریم / كویه / ی ٠ ن ٠ ك
١٥ ـ سید حسین سید رحمان / كویه / ی ٠ ن ٠ك
١٦ ـ ابراهیم فتاح رسول / سلیمانی / ی ٠ ن ٠ك
١٧ ـ نامق محمد كریم / سلیمانی / ی ٠ ن ٠ ك
١٨ ـ عمرعبد القادر أمین / سلیمانی / ی ٠ ن ٠ك
١٩ ـ نوزاد حیدر احمد / كومەڵەی رەنجدەرانـــــی
كوردستان / چه مچه مال ٠
٢٠ ـ یوسف حاجی سعید / عاموره / ی ٠ ن ٠ك

٢١ ــ ابو بكر نوری قادر / کومەلە / سلێمانی
٢٢ ــ محمود حەمەئەمین اسماعیل / یاخسەمەر / ی ٠ ن ٠ ك
٢٣ ــ رشید ابو بكر / کویە / بێ لایەن
٢٤ ــ عبدالله خدر / رەوتی / ی ٠ ن ٠ ك
٢٥ ــ طارق جمیل جاسم / دهوك
٢٦ ــ علی عبدالله قادر / سەراو / ی ٠ ن ٠ ك

ئەم ناوانەش لە ماوەی مانگێکدا ئیعدام کراون :

١ ــ طاهر محمد مراد / هاوری
٢ ــ یاسین غفور / سلێمانی
٣ ــ لطیف حمە صالح / سلێمانی
٤ ــ حەمەئەمین صالح و حسین صالح ( دوو بەرائن خەلکی دێیەکی ناوچەی هەلەبجەن )
٥ ــ احمد عبد الرحیم / سید صادق / ی٠ن٠ك
٦ ــ عزیز محمد احمد / هەلەبجە / ی ٠ ن ٠ ك
٧ ــ عبدالله احمد عبد الرحمن / هەلەبجە
٨ ــ حمە رشید محمد / هەلەبجە
٩ ــ حسین محمد کاکە وەیس / هەلەبجە کومەلە .

هەروەها تاکو ئێستا زیاتر لە ( ٢٠٠ ) کەس ئیعدام کراون لە موصل ، میری خوێن ڕێژ بەرد موام سوورە لە سەر سیاسەتە گەوج و بوگەنەکەی خۆی ئیمە ئامادەمی بوون بە قوربانی بو رزگاری میللەتەکەمان تیایە و هەر دەبیت بە خوێنی گەش و ئالی ئێمە سەربەستی بەدەی بهێنین ٠

هاوری یان :

هیوام وا یه که هەر روژیك سەرکەوتنمان بەدی هینا بین و لا شەکانمان بەرنەوە بو سلیمانی لە گرد یك لای شەهید ئارام بەم نیژن . هیوام وایە کە لە گوڤارەکاندا یادمان بکرینەوە و لە بیر نە چین . هە میشە دەستی یارمەتی بو کەس و کــاری شەهیدان دریژ بکەن و لەبیرتان نەچن ، چونکە پرسینەوەتان مانای وایە کە ئیوەی دلسوز کوری راستە قینەی میللەتــن هەروەها هیوادارم کە ئەم نوسراوەی دەینووسم بوتان هەلــی بگرن و پاشەروژ لە گوڤاریکی شورشدا بلاوبکرینەوە . وەکــو یادگاری شورشگیریك جاتکایە بلاوی بکەنەوە کەوا لە بەـــە ك پەرەدا دەینووسم .

ئەگەر تواناتان هەبوو بینیرن بولای (( . . . . . )) لــە سەرەوە طبعی بکات و بلاوبکرینەوە وە تەنیا وەسیەتم ئەمەیە .

سلاو و ریزم بو هەموو پیشمەرگەیەکی قارەمان کە خــوی راگرتووە بەرامبەر بە هەموو درندایەتی دوژمنان .

سلاوم هەیە بو هەموو پیشمەرگە قارەمانەکانی ناوچــەی قەرەداغ .

ئیتر بەرەو سەرکەوتن و بەدی هینانی پارتی پیشرەو سەرکەوتن بو گەل
مردن و روورەشی بو دوژمنانی گەل و نیشتمان
هەزاران چەپکە گولی سوور بو گیانی پاکی شەهیدان

ابو بكر نوری قادر (( ئاشتی ))

## نامەی ژمارە ٧

شەهید : ئاشتی

ئەی کرێکارانی جیهان یەکگرن

مرۆڤ بە نرخترین سەرمایەیە

هەرکاتێ چەوساندنەوەی مرۆڤ بۆ مرۆڤ کۆتایی هـــات
چەوساندنەوەی نەتەوەش بۆ نەتەوەیەکی تر دوایی دێت ·

بۆ کۆمیتەی سەرکردایەتی کۆمەلە

**هاوڕێیان :**

ئاواتم سەرکەوتنتان و بەدیهێنانی مافی ڕەش و ڕوتـــی میللەتە هەژارەکەمان و باشەڕۆژێکی ڕوناکە بۆ هەمو چەوساوەکان ·

من کە هاوڕێی یەکێ ( کملك ) م کۆمەلەی مارکسی ـ لینینی کوردستان ، تەنها شت کە بتوانم شانازی پێوە بکەم ئـــەوەیـــە کە گیانی خۆم پێشکەش بە کرێکاران و جوتیارانی هەمو جیهان کرد وە بەوپەڕی بیر و باوەڕەوە یەتی خنکاندنم هەلبژارد بـــۆ خۆم و گیانی خۆم کردە قوربانی بۆ ڕزگاری کورد و کوردستان ·

ژیان خۆشە ، بەلام مردن لە پیناوی گەلدا خۆشترە ،من ژیانم خۆش دەوێ مانای وانیە کە خۆمان دەدەین بە کوشـــت ژیان هەر هیچ ناهێنێت ، بەلام ژیان هێندە خۆشە بـــۆیـــە بۆ ژیان سەرزاراب گیان دەکەینە قوربانی ، هەروەهایکیـــــش ڕێگەی خەباتی گرت دەبی ڕون و ئاشکرا بیت لە لای کە بـــە هۆی لێبوردنی ئەوەوە لە ژیان و ژیانی خوی هەزاران دەگەنە

ئاوات ٠من حەزم دەکرد زیاتر لە سەنگەری پیشمەرگایەتیــــدا بمامایەتەوە بو ئەوەی زیاتر خوم گوش بکردایە و زورتر خزمەتــی چینی زەحمەتکیشانی کوردم بکردایە ، هیوام وایە ئەو ریگەیــەی کە ئیمە گرتومانە ئیوە تەواوکەری بن ، پیروزبایی سەرکەوتنتــان لی بیت ، هیچ گومانم نیە لەوەی کە ئیوە سەرکەوتن و سەربەستی بەدی دەهینن ٠

بە شانازیەوە ئەو پەتە دەکەمە ملم کە کراوەتە ملی شەهیدان جەعفەر ، ئەنوەر ، شەهاب و ئیمە نیشانی میری دەروندمــان داوە کە ئیوە و ئیمە هیچ باکمان نیە لە مردن ٠

هەزاران سلاو بو هەموو شورشگیرانی جیهان لە هەر کوییەك دەجەنگین دژی چەوسینەرەکان ، وتە گرنگەکەی گیفارام کەوتەوە بیر کە دەلی گرنگ نیە لەلام لە کوی و بو کی ئەمرم ، گرنــگ ئەوەیە گویم لە دەنگی شورشگیرەکان بی کە ناهیلن چەوسینەر و فاشیستەکان لەسەر گیانی هەژار و بی دەسەلاتان بژین ٠

حەزم دەکرد کە تەمەنم دریژ بوایە هەتاوەکو رزگــــاری کوردستانی عیراقم بدیایە و بو ماوەیەکی کورتیش بوایە ببومایــە بە پیشمەرگــە لە ریزی پیشمەرگە قارەمانەکانی کوردستانــــی ئیراندا ٠

من کاتیك ئەخنکینریم هەر هیچ نادوینم بەلکو زیــــانی هەتاهەتایی لەناو میللەتەکەم دا بەدەس بهینم هەروەکو ماموستای پیشەواو مەزن مارکس ئەلیت : چەوساوەکان کە دژایەتی چەوسینەرەکان دەکەن هیچ شتیك نادوینن بیجگە لــــــە پەیوەندەکانی ژیانیان نەبیت ، بگرە بەم کارەیان هەمو جــیهان

دەبنەوە بو خویان و ناوی هەتاهەتایی بو خویان دروست دەکەن ٠

هەر مروڤیك كە دیتە ریزی تیكوشانەوە لە كاتی كاركرد نیا هەر دەكەویتە هەندی هەلەی نەشارەزاییەوە ، منیش یەكیكم كە ئیشم كرد ووە و بی هەلە نەبووم ، بەلام هەر هەلەیەكم كرد بیت رەخنەی توند و تیژم لە خوم گرتووە و ئیستاش داوای لیبوردنتان لی دەكەم ، من لام وایە كە خو بە تەواو زانین لە هەموو كاركرد نیكدا گەورەترین نەخوشییە چونكە كە مروڤ ئیشی كرد هەلەش دەكات ، گرنگ راستكردنەوەی هەلەی خویەتی و دان نانە بە هەلەكاندا ٠ حەزدەكەم كە پیروز بایی من یەكەم پیروزبایی سەركەوتن بیت لە شورشگیرانی كورد ٠

هەروەها تكام وایە كە (( ٠٠٠٠٠٠ )) زور زور ئاگادا ری خوی بكات و خوی بپاریزیت چونكە پاراستنی خوی لە پیناوی شورشو میللەت دایە و میریش زورزور هەولی لەناوبردنی ئەدا ٠

هەزاران سلاو بو گیانی پاكی شەهیدان شەهاب و جەعفەر و ئەنوەر و شەهید ئارام ٠

ملمان دائەنەوینین لە ئاستی خیزانی شەهیداندا ٠

مردن و روورەشی بو خائینان

سەربەرزی و نە مری بو شەهیدان

هەزاران سلاو بو پیشمەرگە ئازە مانەكان كە بەرگری لە خاكی پیروزی كوردستان دەكەن ٠

سەركەوتن هەر بو گەلە ، تیشكان بو دوژمنان ٠

بەرەو ئاسوی رووناك ، بەرەو ریگەی سەركەوتن

* ئاشتی *

## نامەی ژمارە ٨

شەهید : شەوکەت ( عزیز عبدالله زوراب )

شەهید عەزیز عەبدوللا زوراب کوری بنەماڵەیەکی هەژاری سلیمانی بوو ، لەبەری قەرەداخ پیشمەرگە بوو وە لەناو پیشمەرگەدا بە شەوکەت ناسرابوو ، روژی ٣/ ٩/ ١٩٧٧ لە هیرشیکی دوژمندا بوسەر گوندی قازانقایە ( قەرەداخ ) لە کاتیکدا شەش پیشمەرگە لە هاوریکانی شەهید بوون ، ئەمیش بە دیل گیرا • دوای ئازاردانیکی درندانە لە هەیئەی کەرکوك بریاری خنکاندنی دراو لە ٢١/ ١/ ١٩٧٨ دا لەگەل دەستەیەك لە تیکوشەرانی گەلەکەمان لە سیدارە درا . نامەکەی شـــەهید عەزیز جگە لەم بەشەی کە لیرەدا بلاو ئەکریتەوە لیستەی نـاوی (( ٨٤ )) شەهید و چەند پارچە شیعریکی شورشگیرانەشی تیدا بـــوو ) •

بو بــرایانــی بەریزم

سلاویکی شورشگیرانە پیشکەش بە هە موو هاوری یەکـــی ریگەی راست گرتوو ، زور سەلامتان لی ئەکەم و هەوالی خوشی وە سەربەستیتان ئەپرسم ، هیوام خوشی و باشیتانە ، هیوادارم لە شورشە پیروزەکە ماندا سەرکەوتووبن بو ژیانیکی سەربەستی و یەکگرتن و یەکسانی •

ئیتر خوشیتان بو ژیـــان ، باقی وە سەلام

هاوریی خوتان

عـــەزیز عەبدولـــــلا زوراب

رەدهەی ئیـــعـــدام ـــ نەینـــەوا

پیشکەش بە هاوڕێیان بۆ ئەوەی زرووفی سجنەکان بزانن :

سەرتان نەیەشینم با باسیکی (( هەیئەی کەرکووك )) تان بۆ بکەم چ ژیانیکی تیدایە بیزانن ، یەکەم جار کە ئیمە چوین لە فیرقەی کەرکووکەوە ڕەوانەی هەیئەیان کردین ، هیشتا نەچوبوینە ژوورەوە دایان گرتینەوە بە لیدان دوای لیدان دەستیان گرتین و بردیانینە حەوشە ، چون حەوشەیەك ٠٠!؟ حەوشەیەکی بچووك کە سێ هودەی تیدایە ، کە ئیمە سەیرمان کرد حەوشەکە لایەکی هەلچنراوە لە کەل و بەلی سجنەکان لایەکی تر هەمووی پیلاوەشرە ، چاومان کەوت بە حەوشەکە رەش بەبوەوە ، دیوارە خشتەکانی نیسرەی شکا بوو ، وتیسمان ئیستا رەمیمان ئەکەن ، بەلام سێ حەرەس هاتن بە شەق و بوکس و سوندە دایان گرتینەوە کە چوینە ژوورەوە سەرمان سوڕما ئەو هودە بچوکانە ئەو هەموو کەسەی تیدایە ، هەمووی وەکو مردوو قسەی لە دەم نایەتە دەرەوە ، هەموو سەر و ریشرهاتوو رەنگیان لە بەشەری ئیستای نەئەکرد ، هودەیەکی بچکولە ( ٣٧ ـ ٤٠ ) کەسی تیا جیگە نابیتەوە ، بەپیوستە هەردا ـ نیشیت ، خەوتن بە نورە بوو ، ( ٤٠ ) کەس سەتلیك ئاویان ئەدایێ ، لەو گەرمایەشدا کە عارەق لە ژیرمان وەکو ئاو ئەرویشت ، هەموو گەر بوبوین ، هی وای تیا بوو شەش مانگ مابوەوە هەر بۆ ئیفادە وەرگرتن ، بەلام چەند کەسیکمان مردن وەخنکان لە تینواندا ، دەرگایان لێ نەئەکردینەوە ، ئەیان وت سە فتەی کەن ، ئەگەر قسەیەکمان بکردایە بە سوندە بومان ئەهاتن ، وایان لێ ئەکردی ، بێ عەمەلیان ئەکردی ، خوا ـ ردنەکەی روژی دوو سە موون و نیو پیالە چا ، ئەویش ئەگەر

ببوایه ، هی وائەبوو بەری نەئەکەوت ، نان خواردنی نیوەی ڕوان یا شماوەی عەسکەرەکان بوو بویان ئەهێنا ین ( ٣ ــ ٤ )

ئەزعە بوو ( ٩٥ ) کەس بە ڕاکردن ئەچوینە دەرەوە ، سەرت شور ئەکرد و ئینجا ئەچوینە سەر خواردنەکە ، لە سەر خواردنە کەش بەسوندە دایان ئەگرتینەوە ، یەکێ پارووەکمان بەرئەکەوت یا نا ، ڕاست ئەکردە ژوورەوە ، لە دەرگاکەدا حەرەسێك وەستا بوو ، یەکێ پینج سوندە کەسی لی دەرنەئەکرد ، ڕیش سپی وای تیا بوو لە هودەکاندا ئەمرد ، نانخواردنی ( ٩٥ ) کەس بە ــ ٣ ــ دەقیقە بوو ، ڕاست ئەکردە ژوورەوە ، جساری وابوو مانگێ جارێك دەم و چاومان نەئەشت ، نەخوشی کەوتە هودەکانەوە ڕوژی یەك دوو کەسمان لی ئە مرد ، ڕەزالەتیکمان هەبووهیچ کەسێك لە دنیادا بە خویەوە نەیبینیبوو کە ئینسان وای لی بکرێت ، من دەوری دوو مانگ لەوی بووم ، تیشکی خور لی ی نەدام .

## ئیفـــادەوەرگرتن

( ڕەعد ) کە زاپتێك بوو لەوی هەیئەی بەرێوە ئەبرد ،کە بانگی ئەکردی دوو جندی ئەهات ، لە دەرگای هودەکە نـــە ئەهاتیە دەرەوە چاویان ئەبەستی ، بەبی پرس بە شەق و قونا ــ غە تفەنگ ئەیانبردی بولای زابت ، دوو پرسیاری منالانەی لی ئەکردی و یەکسەر ئەیان ناردی بو تەعزیب ، بی قسە بیبەن قاچیان ئەبەستی بەعەمودی سالونەکەوە دوو سەعاتی بالضبط لی یان ئەدایت دووانی ئەیان بردیتەوە ، نەئتئەتوانی لە سەر قاچ بڕوی ، بە چوار دەستە ئەیان بردیت ، لەوی پرسیاریکی لی ئەکردی و ئەگەر بتوتایە ئاگام لی نییە ئەیان ناردیتەوە بـــو

لیدان ، ئینجا شەش‌حەندی بەتورە لی یان ئەدایت ، دیان
لە قاچت یەکیك دەم و قورگی ئەگرتن دووان ئەچوونە سـەر
هەوروو دەستت ، ئیتر بە نورە لی یان ئەدایت ، یان دەرئەـ
چوویت یان نا . دەوری بیست کەس لەژیر تەعزیبدا مردوون ،
هوای تیدا بوو کە هیچ شتیکی لەسەر نەبوو لە ژیر تەعزیبا
مردووە . چەند کەسیکیان بە غەلەت ناوەکانیان هاتبوو هەر
ئاگایان لە هیچ نەبوو ، سی مانگ لەوی بووە ، بیجگە لـە و
هەموو تەعزیبەی کە لی یان ئەدایین ئیتر زەلامی تیا نەبـوو
خوینی بیوە نەبی ئەگەر گیانیان کەلکی نە مابە لە تەپلی سەریان
ئەدا و لە کارەبایان ئەدا هەتا دەرویەکیان بو ئەکات .

سی مانگ بوو مەحکەمە نەکرابوو ، ژمارەی گیراوەکـسان
گەیشتبووە ( ٣٠٠ ) کەس و زیاتریش ، دوای سی مانـگ
مەحکەمەیان کردین بردینیان لە سەیارەیەکی سجندا بەدوو
کەرەت مەحکەمەیان کردین ، چوینە ئەوی دابەزین ، دەوریان
هەمووی مەغاویر گرتبووی ، چەند حەرەسیك کە بە سونـدەو
شەق و داردایان گرتینەوە ، خستبوینیانە شوینیکەوە سەریان

تووسا نەد بوین بە دیوارەکەوە ( ٣ ــ ٤ ) کەس کەوتبوون بـە
سەر یەکەوە ، چەند کەسیك بورابەوە ، چەند کەسیك میـزی
بە خویدا کرد ، حالیکی وایان بەسەر هینا بووین قەد بـە
سەرماندا نەهاتبوو ، یەکە یەکە دەستیان کرد بە سەر هەلپاـ
کیشمان ، چەند کەسیکمان سەریشی چاك نەکرابوو بانگیـان
ئەکرد بو مەحکەمە ، پرسیاریکی هیچ و پوچیان لی ئەکـرد و
حوکمیکی بو دائەنایت ، حوکمیکی قەرەقوشی وەك یانسیـب
وابوو ، یان ئیعدام یان ئەبەدی ، کەسیان لو دەرنەئەکرد ،

ئه چوینه ئەوێ پیمان بی ئەگەتین لە جیاتی پرسیار کردن لە سەر جی گیراوی یان تا سەبری سەر و چاوی، ئەکردی حوکمی بو دائەنای ، بە سێ چارەك دەوری ( ۲۰۰ ) کەسیان مەحکەمە کرد ، ئیمە ( ۱۲ ) کەس بووین حوکمی ئیعدام درابوو بەسەرماندا ، من یەکێك بووم لەو جەماعەتە کە زورم پی خوش بوو لەو رەزالەتە رزگارم بوو ، دووابی چووین رەسمیان گرتین ، یەکی قیتعەیەك کە ناوی خومانی لە سەر نووسرا بوو کرد بوویانە ملمان دواپی دوو دوو کەلەپچەیان کردین و بردپنیانەوە بو ( هەیئە ) ، بردپنیانە ژوورێك هەر دوواتزەمان نەیان ئەهیلا فزە بکەین ، لە ژیر دەرگاکەوە ئاو و خواردنیان ئەداپنی ، روژی دوو جار ئەجوینە سەر ئاو ، جەرەسەکان دووسی یەك بە کلاشینکوفەوە لە لامان وەستا بوون بیجگەلەوە هەموو روژێك بە سوندە تیمان ئەکەوتن ، شەش روژ لەوی ماینەوە ، دوای شەش روژەکە بەیانی زوو رەوانەی ( مووسل ) یان کردین ، پاش چەند سەعاتیك گەیشتینە ئەوی ، بە نەشید موە ریگامان بری چووینە بەر دەرگای ( سجنی مەرکەزی موسل ـ رەدهەی ئیعدام ) ناونیشانی خومانیان لی سەندین ، خەلکی چ گەرەکێکین ، دوای تەواو بوون ریزیان کردین و کرد نیانە هودەی ئیعدامەوە چوینە ژوورەوە هاوری یانمان لەوی بوون ، هەمو دەستمان لە ملی یەك کرد و هەتا ئیستا هەر ماوین ، تا تەنغیزەکەمان دیتەوە ئەنیرن بە شوین دایك و باوکمان دا ، ئەوەی هات باشە و ئەوەی نەهات هیچ ئیتر لە هودەکەدا ین دەست لە کەلەپچەدا تا سەعات ( ۱۲ ) دووایی ئیعدامت ئەکەن .

دوور بینی ئەو شەهیدانە کە ئەچن بەرەو پەتەکە

هەموو رۆژی هەڵبەست و گۆرانی و هەڵپەرکێمان کردووە بە پیشەیەکی سەرەکی ، مێشکی دوژمنمان شڵەقاندووە ، بەجاری تۆقیون ، هەموومان بە یەکەوە ژیانێکی کۆمەڵی خۆش ئەبەینە سەر ، کە لە هەموو بارێکەوە موناقەشە ئەکەین ، هیچ کەس بیری ئەوەی نییە کە ئیعدام ئەکرێت ، کە گەورەکانی میری دێن بۆ سەیر کردن بۆ سەر مەشنەقەکە ئەو شێرانەی ناویان ئەخوێند رێتەوە یەکسەر بە هوتاف لێدان و هەڵبەست و شیعر بە عەرەبی و بە کوردی و بە ئینگلیزی و بە یادینانی و بە تورکی هوتاف لێئەدەن ، هەموو موسڵ گوێی لە دەنگیانە ، هیچ کەس ناوێرێت بچێ بەلایاندا هەتا هوتافی خۆیان تەواو ئەکەن ، بە ئارەزووی خۆیان دەست ئەگرن کە کەلەپچەیان بکەن ، ئینجا شێرانە بەرەو رووی پەتەکە ئەرۆن ، کە باڵ و دەست و سنگیان بە گوش ئەپێچن ، ئینجا توورەکە رەشەکە ئەکەن بە سەریاندا بەلام هەر هەند بکیان ئینکاری ئەکەن لەوەی کە توورەکە رەشەکە ئەکەن بەسەریاندا بەلام هەر ئەیکەن بە سەریاندا ، هودەی ئیعدام دەرگاکەی لە سەر هودەکەی ئیمەیە ، ئیمە ٣ی هودەمان هەیە کە هەرسێکیان پڕن ، دەرگاکانیان شیشی ئەستوورن ، دیوارەکانی (٧) مەتر بەرزن ، هەر ئاسمانت لێوە دیارە کە خەرێتەی دروست کردنی ئینگلیز بووە .

هودەی ئیعدام شەش حەبلی تێدایە ، ئەو شێرانەی کە بەدەستی ئەو درندانە ئیعدام ئەکرێن دوای ئیعدام ئەیان بەن بۆ خەستەخانە دەوری چوار رۆژ لەوی

ئەمینیتەوە کە چاویان دەرئەهینن لەگەل ناو سنگیان دەووایی
ئەیان بەن ئەیان کەن بە ژیر گلەوە ناهیلن کەس و کاریان
بچن بو سەر قەبرەکانیان چونکە حەرەسیان هەیە ئیتر ژیانی
گەنجەکانی کورد ئەمەیە کە گوی نادەنە منال یا پیر ، مستەقبە-
لمان هەر ئیعدام کردنە ، هیچ باوەریکمان بە ووت و ویژە
بو گەنەکەی میری نییە ، جەماعەتی خوی کە هیچ ژیانیکی
کەسی تریان ناوی ، ئیللا دڕندەیی خویان بەسەر شەعبی
عیراقیدا ئەچەسپینن و بە زوری بەسەر گەلی کوردی تیکوشەردا
هەر لە ناو ئەچی ، با برووخی جەماعەتە بوگەنەکەی حوکمی
فاشیست • هەولدان بو سەرکەوتن و بو ژیانیکی سەربەستی

ئیتر خوشیتان بو سەرکەوتن

هاوریتان
عەزیز عەبدوللا زوراب

## نامەی ژمارە ٩

شەهید : مەلا عەلی ( حسین مولود احمد )

هاوری یان :-

پیشەکی با دەست بکەین بە باسکردنی سلاو و ریزی برادەران ئەگەیەنین بە هەمو ئەو کەسانەی کە ئیمەیان لە یاد مو لە بیرمان ناکەن کە ئیمە لە پیناوی خاکی کوردستان و تولەکردنەوەی شەهیدانی شاری قەلادزی و شاری هەلەبجەی خویناوی و شاری سلیمانی خوشەویست کە شاری هەلمەت و قوربانین و لە ناو کوردستانی خوشەویستدا گیراوین و حوکمی ئیعدامان دراوە .

١ ـ برایانی خوشەویست :

برایانتان کە لە ناو شاری شەهیداندا گیران بو ماوەی بیست و چوار سەعات لە روژی ١٠/١١ بو شەوی ١١/١١/١٩٧٧ بە دەستی رو رەشەکان گیراین کە کوردن وەکو (( ..... )) و (( ..... )) .

لە روژی ١٣/١١ هاتین بو کەرکوك بە تەیارەی هەلیکوپتەر . سی شەو لە منظمەی شمال ماینەوە ، دوای ئەوە کە شەو تاقیبیان لی کردین پی یان وتین ئیوە بەرئەبن و ئەگەرینەوە بو مالی خوتان ئیمەش کە دەنگی مفاوەزاتمان زانیبو زور دل خوش بوین . وە لە روژی ١٧/١١ هاوردیانین بو هەمینەی تە حقیق هەر لە کەرکوك لەوی دەستیان کرد بە تەعزیب کردنمان بە سوندە و شەق و شەقازلە ، کە کردیانینە ژوری سجن دیتمان کە ( ٧١ ) برادەری کوردی تیا بو ، کە

چاومان پی یان کەوت بەراستی لێ یان ترساین ، وامان زانی کە ئەمانە تەعزیبی ئێمە ئەدەن چونکە لە بەشەر نەئەچون لە بەر سەر و ریشیان کە ئەتوت جنوکەن ، کاتێ سەلاممان کرد بە شێوەیەکی نهێنی وەرامی سەلامیان دایەوە و پێ یان وتین کاکە هیچ قسەمەکەن ، ئێمەش بەبێ بەتانی و بە پێ خاوسی و بەبێ پشتێن ماینەوە و بەبێ دەنگی بەلام رۆژی دوجار دەر ئەچوین بو ئاو دەست و لە سەعات شەشی بەیانی نانمان ئەخوارد و ئەیان کرد ینەوە ژوری لیدان و بە لیدان و سوندە وەشاندن تاکو لە ژوریان ئەکرد ینەوە ، دوایێش دائەنیشتین بەبێ دەنگی ، جگەرەش مەمنوع بو ، لە سەعات دو تاکو سێ ئەبوایە نانخواردن و ئیشی مەرافیقمان تەواو بکردایە لە ترسی لیدان و جنێوی سوك و خوێری کە بە دەستی بەعسیە فاشیستەکان پێ یان ئەکرد ین ، ئێستا بێینە سەر باسی ئیعتراف کردنی هەیئە کە بە زور ئەبوایە ئیعتراف بکەی ، ئەیا ئەهێنا توند هەرد و قاچیان بەرز ئەکرد ینەوە و توند توند دارعەمودی هەیوان ئەیان بەستینەوە و بە شەش حەوت جوندی ئەکەوتنە لیدان و تەعزیب کردنی ئەو زەلامە تاکو نیوەرو سێ چوار جار ئەبەسترانەوە لەسەر حەوشی چیمەنتو بەو هەمو قاچی ئاوساوی و خوێن لیهاتوی ئەبوایە هەلورە بکردایە . لەم سەری حەوشە بو ئەوسەری حەوشە دو سێ جوندی رائەوەستان لە کاتی هەلورە دەستیان ئەکرد بە لیدان . ئا بەمجورە بەعسیە فاشیستەکان هاولاتیانی کورد ئیبادە ئەکەن .

ئیمه که ژمارمان له هەیئەی کەرکوك بیست و دو نەفــــەر بوین له روژی ۳۱/ ۱۲/ ۱۹۷۷ که ریکەوتی شەممــــە بــــــو برد یانین بو مەحکەمە نا عادیلییەکمیان لەویش پرسیار و جواب نەبو تەنیا وەرەقەی سپیان پی ئیمزا کردین و له بیست و دوو کەس شازده ۱۰ راین به ئیعدام باقی ئەو شەش کەسەی کــــه مانەوه دوانیان عەسکەری بون وه برادەریکیان خەلکی گوندی (( سکتان )) بو که ناسراوه به (( ..... )) .

ئا بەمجوره کرد مەکانی بەعسی فا شیست دەرئەکــــەوی و دەرکەوتوه بەرامبەر هاولاتیانی گەلی کورد ، شانزه نەفەرمــان لەمانه برادەریکی عەرەب بو که ناوی (( کاظم عباس صیال )) بو که له شەوی ۱۱/۲۱ / ۲ئەمری رەمی دەرچو له سەعات شەشــی بەیانیان رەمی ۲/۱کـــرا .

( لیره به دواوه نامەکەی شەهید مەلا عەلی پەیوەندی به کار و باری ریکخستنەوه هەیه و سەبارەت به نهێنی پاراستن و بەرژەوەندی گشتی بلاوی ناکەینەوه ) .

ئیتر بو پیشەوه له ژیر ئالای کومەلەی رەنجدەرانــــی کوردســــتان .
مردن و سەرشوری بو خوفروش و خوین مژانی کورد .
کەوتن و نەبەزی بو ئازادیخوازان .

۲۲/۲۳ / ۷/ ۱۹۷۹ شەوی له سیدارەدان

حسین مەولود
( مەلا عەلــی )

## نامەی ژمارە ١٠

شەهید :مەلا عەلی

همو کاتیکت باش

بو بەریز و خوشەویست (( ...... ))

پیشەکو سلاویکی گەرمت پیشکەش بیت هیــــوام خوشی و شاد مانیتە ·زور هەولم دا نامەکەم وەکو نامەی هاوری یەکی تەنزیمی بنوسم ، بەلام دەمەوی وەکو ناسیاویك لــــە وەزعی خوم ئاگادارت بکەمەوە ·

هیچ کەسیك نییە کە بە دلسوزی بیتە مەیدانی خەبــات منەت بەسەر کەسدا بکات ، بیگومان منیش نامەوی منەت بــــە سەر کەسدا بکەم وە ئیستایش خوم بە دواکەوتو دەزانم کـــە نەمتوانیوە زوتر وەکو شەهیدانی تر ببمە قوربانی بو پاراستن و بەدی هینانی داخوزای چینی چەوساوە ·

ئیستا شدا اوای پاداشت ناکەم ، بەلکو ئەمەوی نـــاو و ناتورەی خراپم دوانەخەن و وەکو بە هەندی کەسیان وتبو لـــە بیناوی (( گیپە )) دا گیرا منیش کەس نەبو چەکداریکم لەگــەل بنیری و رەنگە ئیستاش بلین سەرکیش بو ( لیرە بە دواوە نامە کەی شەهید مەلا عەلی باسی چونیەتی گرتنی ئەکا و زوربـــەی ئەوشتانەی باسی کردون پەیوەندیان بە کار و باری ریکخستنــە وە هەیە و لە هەلومەرجیکی وەك ئەمرودا بلاو ناکریتەوە) ·

( مەلا عەلی )

حسین مولود

نامەی ژمارە ١١
شەهید : حەسەن عەلی نادر

بسم الله الرحمن الرحیم

بو باوکی خوشەویستم
باوە گیان :
وا من ئیعدام کرام لە تەشرینی ٢٦/ ١١/ ١٩٧٨ لە شەوی دووشەم سەعات (١٢) ی ئەوە شەو .

باوە گیان حەفەت بو من مەخورن ، عبدالله و حسین و تەریق خوش من ، من زور شوکرم ، الحمدلله بەس نییە بەسەر بەرزی رویشتم ، بیخوشحالم بەم مردنە چونکە خوا دروستی کردوویم و خواش ئەمباتەوە .

باوکە گیان : داواتان لی ئەکەم خیر و خیراتم بـو بکەن بەلکو خوای گەورە لیم خوش بیت .

دوای من خوتان رەش پوش مەکەن چونکە من لـە پیناوی کوردستان رویشتووم .

باقی والسلام
کوری خوت
حسن علی نادر

نامەی ژمارە ١٢

## شەهید : هوشیار صالح مصطفی

### کوردستان یان نەمان

هاوڕێی بەڕێزم کاك (( ٠٠٠٠٠ ))
ئەم کاتەت باش

برای بەڕێزم ، من دوای چەند سەعاتیکی تـــــــر خەلاتی ( نوبل ) ی شۆرشگێری دەنێمە گەردن و دەگەمە وە بە کاروانی شەهیدان و ەکاروانی تیکوشان بۆ ئیوەی خەبات گەر ، تیکوشەر ، بەجێی دەهیلم ، کاکە (( ٠٠٠٠٠٠٠ )) راستە من لە ڕێگایەکدا لە سیدارە دەدریم جیگەی شانازییـە بەلام داخ لەوەدایە کە ئەو خەباتەی خۆم دەمویست بــــە تەواوی نەمکرد ، تکا ئەکەم کە ئاگاداری خوت بیت ، زور بــە وردی خەبات بکەیت بو بەرگری کردن لە کورد و چینی پرولیتار لە گەل هاوری مارکسی یەکانی‌تردا خوت بە خورایی تەفەوتینی .

برای بەریز :

زورم حەز ئەکرد لەو مەفرەزەیەی کە پیکمان هینا بـــوو لە خەباتیکی دریژ خایان بەشداری بکەم و تولەم لە فاشـــی یەکان بکەمەوە ، بەلام تکا ئەکەم کە مەفرەزەیەك هەر بەو شیوەیـە پیك بهینریت حەز ئەکەم ناوی بنین مەفرەزەی ( شەهیـــــد هوشیار ) چونکە وائەزانم کە خوم ماوم و دژی دوژمـــــن و ئەمسالی (( ٠٠٠٠٠ )) خەبات ئەکەم .

برای بەڕیزم :

(( ٠٠٠٠٠ )) هاتە ڕیزەکانی پیشمەرگە ٠٠تکا ئەکەم ئاگات لی ی بیت وە بە هیچ جوری تەهیلی بچیتەوە بـــــو سلیمانی چونکە نە کرد مو و منالە وە وا بزانە متم زور ئاگاداری بە تکایە ، تکا ئەکەم ناوی نهینی (( ٠٠٠٠٠ )) ناو بنیـــن (( هوشیار )) چونکە وا ئەزانم خوم ماوم ، برا گیان مـــــن پشتم زور بە تو ئەستوورە کە تولەم بسینی ئیتر توش خـــوت و خوای خوت زور زور سەلام لە (( ٠٠٠٠٠ )) ئەکەم وە هیـوام سەربەرزی یەتی لە ژیاندا •

برا گیان :

من و کاک شادمان تەنها چەند سەعاتیك ژیانمـان ماوە ، وە زور سەلامت لی ئەکات ، هیوای سەربەرزیتە ، چەند ڕوژیك لەمەوبەر (( ٠٠٠٠٠ )) هات بو ڕەدهەی ئیعدام ، زور سەلام لە ڕیزەکانی پیشمەرگە ئەکات •

هیوادارم هەر بمینی بو خزمەت کردنی کـــــورد و کوردستان و بیر و باوەری مارکسیزم ــ لینینیزم •

ئیتر سەربەرزیت ئەوپەری هیوامە

تکا ئەکەم قەرەداغ بە جی نەهیلی ، ئاگاداری خوت بـــە ! •

هاوریت

هوشیار صالح مصطفی

١٩٧٩/١/١٣

نامەی ژمارە ١٣
ئەمید : هوشیار صالح مصطفی
کورد ستان یان نەمان
بەریز فەرماندەی هەریمی ( ٥ )
سلاویکی شورشگیرانە ·

من و حەوت هاوریی تر پاش چەند روژیکی تر پەتی سیدارە دەنیینە گەردن و کاروانی تیکوشان بەجی دەهیلین بو ئیوەی تیکوشەران ، هیوامان وایە زیاتر ببنە بلیسەی ئاگر و بچن بە رووی رەشی ئەواندا کە خوینی مروڤ پیکی ئارەقی دەستیانە تا مافی چینایەتی و نەتەوایەتی گەلی کوردمان بە دەست بیت · · ·

بەریز :

روژی ١٦/ ١/ ١٩٧٩ ، (( · · · · · )) یان هینایە لامان بو رەدهەی ئیعدام جا تکا دەکەین محاولەی بەردانمی بکەن بە رفاندنی ئەندازیاری ئەجنەبی یان گرتنی ضباط یان بە هەر شیوەیەکی تر بیت ، (( · · · · · · )) ئەویەری ورەی بەرزە سلاوی ئەگەیەنیتە ریزەکانی پیشمەرگە ·

بەریز :

(( · · · · · · )) ، لەسەر داواکاری خوم و ویستی خوی دیتە ریزەکانی پیشمەرگە بو ئەوەی دوای من چەکی شەرەف بکاتە شان ، بەلام تکا ئەکەم کە وەك برایەکی بچوکی خوت سەیری بکەی چونکە تەمەنی مندالە ، تا زور زور چاوی نەکریتەوە نەهیلی بچیتەوە بو سلیمانی ئەگەر خویشی داوای کرد ·

بەریز : تکا ئەکەم زور زور ئاگاداری خوبت بە چونکە ( طغمی فاشی بەعس ) زور هەول ئەدا بو کوشتنی تو ، بو نمونە(٠٠٠٠) هاتبوە دەرەوە لە سەر داوا کردنی (( مدیریە الاستخبارات العامە )) هاتبوە دەرەوە وە وا بریار بوە کە لەگەل ((٠٠٠٠٠)) کو بیتەوە بو ئەوەی تەسلیم بیتەوە وە دووەم روژی چەژنی قوربانی رابردوو تو بکوژیت بەلام لە ئیران گیراو تەسلیم بە عیراق کرایەوە ٠

بەلام وادیارە کە دوبارە بە هوی ئەوەی گوایە لە دەست حکومەت رای کردوە دوبارە بیتەوە دەرەوە بو ئەوەی مەبەستی خیانەت بینیتە دی ٠

- لیرە بە دواوە نامەکەی شەهید هوشیار برە لە نهینی ناوخوی شورش کە زروفی ئەمرو ریگای بلاوکردنەوەی نادات - ٠

ئیتر بو پیشەوە
هاوریت
هوشیار صالح مصطفی
١٩٧٩ / ١ / ١٨

## نامەی ژمارە ١٤

شەهید : شادمان عثمان مجید

## کوردستان یان نەمان

کاك (( ٠٠٠٠٠ )) ی بەرێز و شورشگیر ٠

سلاویکی شورشگیرانەی گەرمت ئاراستە ئەکەم وە هەردوو دەستەکانت تیر تیر ئەگوشم ، گوشینیکی وا کە لە ژیر خاکیشدا هاوری یەتیت و برایەتیت لە یادم نەکات ٠

بو ئەو هاوری یەی کە تەنیا دابارینی گولله بو سەر سنگی سوز و خوشەویستی و هاوری یەتیت لە بیرم ئەباتەوە ، کاکە (( ٠٠٠٠٠ )) ی تیکوشەر نەمانی من هیچ دلتەنگت نەکات . هەروو کەس ئەمری و ژیان بو کەس نامینی ٠ بەلی مردنی بەتی سیدارە و دابارینی گولله بو سەر سنگ ، لەم کاتیکدا ناخوشە مروف بی بمری و بەهیچ جوریکی تر نەمینی ، بەلام باش بزانە ئەم مردنەی من جیاوازی هەیە و سەربەرزی و شانازی جی ئەهیلی و ناوم ون نابی چونکە لە پیناوی گەل و چەوساوە و هەژاراندایە ، کە لە کاتیکدا مروف گەیشتە سەر مانگ و کوردستانی ئیمە لە بچوکترین مافی نەتەوایەتی خوی بی بەشە ، بەلی بو کوردستان و چەوساوە ئەمرم ٠

کاکە (( ٠٠٠٠٠ )) بە راستی زور پی خوشحال ببووم بە دەرچوونت بو خەبات کردن وە بانگەوازت بو شورشگیری ٠ هاوری گیان : تا ئەتووانی سەر بو بەعسی فاشست و طغمەی تکریتی فاشی دانەنەوینیت چونکە بە راستی شکستی ئاشکرایە

و له رووخاندایه ، ههرچهند ئهکهن نازانن چون فاشستی خویان پیشان بدهن جا لهبهر ئهوه بهردهوام بن بـــو خهباتی سوور بو گهلی چهوساوهمان و گهلانی چهوســـا وه بهرامبهر به کونه پهرستان و ئیمپریالیزم ، وا ئیمهی لاو خهباتی سوورمان به جی هیشت ، داواکارین ئیوهی نهبهز و تیکوشه ر بومانی تهواو بکهن و ههنگاو بنین بو پیشهوه ۰

کاکهی (( ۰۰۰۰۰ )) ی تیکوشهر ، کاتی که گیـــرا م ترسام لهوهی که ههندی برادهر ههلبین وه وابزانن من بهرگـــه ناگرم و خوم راناگرم بهلام بروا بکه زور نهبهزانه بهرامبهریـــان وهستام وه به هیچ جوریك ناوی هیچ کهسیکیان له مـــن وهرنهگرت و هیچ نهینییهکم نهخسته روو ۰

وه ئیستاش سوورم لهسهر ریبازه پیروزهکهم و هـــاوار ئهکهم لاوانی ریگای خهباتی سوور تیکوشن و بهرهنگاری فاشی یهکانی ئهمروی عیراق بن ۰

هاوری گیان :

برادهرانی ژووری سیداره ، سلاوی گهرمی شورشگیرانه تان ئاراسته ئهکهن ، بهتایبهتی ماموستا عهزیز و کـــاك هوشیار هیوایان سهرکهوتنتانه ۰

سلاو بو ههموو هاوری یهکی خوشهویست و تیکوشهر ۰

له کوتاییدا دوا وشهم که بیبیستی :

بو پیشهوه له ژیر ئالای هاوریی گولله باران کراوت

ی ۰ ن ۰ ك

ك ۰ م ۰ ل ۰ ك

شـــادمـان

۱۹۷۹/۱/۲۵

شەهید : شادمان عثمان مجید

## کوردستان یان نەمان

دوای چەند کاتژمێرێکی تر لە ( موسل ) ی قەسابخانەوە هاوار ئەکەم خالە شەهاب کەم ژیام و کەل ژیام تا هەلیـــــری نەبەزیم تێکەڵاوی دەنگی شەهید ئارام لە دەنگی سەرو شـــەهید ئیبراهیم ئەزو لە یادیمان و شەهیدانی ڕێگەی ڕزگاری کوردستان نەبێت . ئەمی بە یەک ڕەنگ و ئەچمە بەرووی ڕەشی ئەوکەسا ـ نەی کە خوێنی مرۆڤ پێکی ئارەقی دەستیانە ، بۆ ئەو هاوڕێیەی کە بە تەنها بە داباریی گوللە بۆ سەر سینگ بوو و خۆشەویستی هاوڕێ بەتیم لە یاد ئەباتەوە .

هاوڕێی خۆشەویست و نەبەز و تێکۆشەرم کان ( ٠٠٠ ) ی شۆڕشگێڕ پێشەکی بیلاوێکی شۆڕشگێڕانەت ئاراستە ئەکەم وەهەر دەودەستەکانت ئەگوشم ، گوشینێکی وا کە لە ژێر خاکیشدا لـــە یادم نەکات .

هاوڕێی بەڕێزم ئەم مردنەی من هیچ داتەنگت نەکـــات چونکە هەموو مرۆڤێکی خاوەن شەرەف و تێکۆشەر بیری خۆشە و پشتگیریم ئەکەن ، ژیان هەر مردنە و هەموو کەس ئەمری ، ئەم ژیانە سەرپێیە بەجێ دەهێڵرێت ، مانای وایە ژیان بۆ کەس نامێنێت ، بەڵام هاوڕێ گیان ڕاستە مردنی پەتی سێدارە بـــبوا گەردن و گوللە بۆ سەر سینگ لە کاتێکدا ! ناخۆشە کە مرۆڤ تەنها هەر بەو شێوەیە بمرێت و بە هیچ شێوەیەکی تر نەمرێت . وەئەبێ باش بزانیت ئەم مردنەی ئێمە یەک جیاوازی هەیە ئەویش ســـەر

بەرزی و شانازی بەجی دەهیلن و ناویان ون نابیت چونکە لە پیناوی گەل و هەژاران و چەوساوەکاندا ئەمرین ، بەلی لە کاتیکدا ئەمرین کە مروف گەیشتە سەر مانگ و کوردستانی ئیمە لە بچوکترین مافی نەتەوایەتی خوی بی بەشە .

هاوری‌ی خوشەویست :

ئەبی لە یادت بی کە هەمیشە دژ بە زورداران و طغمەی بەعسی فاشیست بووم . وە بە هیوای رزگاربوونی گەلی چەوساوەی ژیر دەستی سولطەی بەعسی بوگەن و کونەپەرستانی ناو گەلی کورد بووم . نازانن بە چ شیوەیەك ئەم گەلە هەژارە لە ناو بەرن ، بەراستی بەعسی فاشستی بوگەن و کونەپەرستان بەس قەپاغەکەیان ماوە . ناوەروکەکەیان بە جاری شکستی هیناوە .

هاوری گیان :

ئیستا شیووەم لەسەر ریبازە پیروزەکەم وە هەمیشە دژ بە بەعسی فاشست وەستاوم . وە نەبەزانە ئەچم بە گژیاندا .

هیوادارم ئیوەی پیشکەوتنخواز هەمیشە بەرد موام بن لە سەر پتەوکردنی ئ.م.ل.ك لە ناو گەلدا .

هاوری‌ی خوشەویستم "کاك....." ی شورشگیر ، جاریکی تر لە موسلی قەسابخانەوە سلاویکی شورشگیرانەی گەرمت لی ئەکەم وە هیوادارم هەمیشە لە سەرکەوتندا بیت . وە جەنگاوەریکی ئازای ریزەکانی پیشەوە بیت .

سلاویکی گەرمی شورشگیرانە ئاراستەی هەموو هاوری یەکی خوشەویست و تیکوشەر و پیشمەرگە نەبەزەکان ئەکەم وە

هیوادارم هەردەم لە سەرکەوتنا بن .

بو بیشەوە لە ژیر ئالای ی.ن.ك

ك.م.ل.ك

ژیان خوشە بەلام مردن لە بیناوی گەلدا خوشترە

هاوریت

شادمان عثمان مجید
١٩٧٩/٢/١٧

## نامەی ژمارە ١٦

شەهید : رسول عمر خیاط و هاوریکانی

بە ناوی خوای گەورە و میهرەبان

یەکیتی نیشتمانی کوردستان

سلاویکی شورشگیرانەی گەرم

لەو کاتەی کە لەژیر بەشی بیدادی و ستەماوی جاوەروانـــــی بودنی ئەکەس لە پیناوی مافی گەلی کورد مان . ئەو گەلەی کـــە کاروانی خەباتی سوورە بە خوینی هەزاران شەهیدی دارە مان ، ئیمەش شانازی ئەکەین بەو ریگەیەی کە لە پیناویدا شەهید بووین بەلام ئیمە داوا لە ئیوە و هەموو پیشمەرگە ئەکەین کەوا هەرکاتی گەلی کورد گەیشتە ئازادی خوی لە بیریان نەکەن . وە منداڵ و باوک و دایکی هیچ شەهیدیک لە بیر مەکەن ، خوینی ئیمـــــە ئەکەویتە سەرشانی ئیوە بو تولە سەندن لە دوژمنان ، تکـــا یە دەستی یارمەتی بو کەس و کارمان دریژ بکەن ، وە تکا ئەکەیـــن مام جەلال مەقالەیەکمان لەسەر بنووسیت بو ئەوەی کەس و کارمان زیاتر شانازی بە خویانەوە بکەن .

ئیتر بو پیشەوە لە ژیر ئالای یەکیتی نیشتمانی کوردستان . سەرکەوتن بو کورد و کوردستان ، مردن و سەر شوری بو دوژمنانی گەلـــەکە مـــان .

هەڤالانتان

١ ــ رەسوڵ عمر خیاط
٢ ــ حسێن عمر شێوملوکی
٣ ــ رەقیب عثمان روستایی
رۆژی ٢٠ / ٢ / ١٩٧٩
ژووری ئیعدام
قەسابخانەی موسل

وەك لە نامەکەدا هاتووە ، ئەو ٣ شەهیدە داوایان کردووە کە هەڤاڵ مام جەلال شتێکیان لەسەر بنوسیت ، ( مام جەلال ) زور بە شانازی یەوە داخوازی یەکەی بەجێ هیناوە و وا لیرەدا دەقی نوسینەکەی بەلا و ئەکەینەوە :

## بو ٣ قارەمانە نەمرەکە

هەڤالانی نەمر .. کاکە وەستا رەسولی خەیات و .. کاکە حسێنی شێوەلوکی و .. کاکە رەقیبی روستایی لە بەرە مەرگا کە دلیرانە بەرەو پەتی سێدارەی خوێن ریژە فاشیستەکان دەچوون گاڵتەی بە بیری رەشی جەللادەکان دەکرد و سوور سوور دەیان زانی کە خوینی گەشی ئەوانیش هەر بەنزینە و دەفرژیتە سەر کلپەی سووری شورشە پیروزەکەمان کە بەتا ، بگرەبە گەرد ملولی توزاوی فاشیستەکانیش نایکوژێتەوە بەڵکو خوشتروبەرزتر ئەبیت ، لەو سات و کاتە سامناکەدا کە چەنگالی فاشیستەکان گەرمکی بوو گیانی شورشگیرانەی ئەو قارەمانانە لە لەشیان جیا بکاتەوە ، بیریان لە خەبات و سەروەری دەکردەوە . وەك هەموو

شورشگێرێکی راستەقینە چونکە لە مانای راستەقینەی ژیـــان گەیشتبوون کە ژیان خەباتە ، خەباتە لە پێناوی گەل و نیشتماندا خوبەخت کردن و فیداکاریش پێیلێکەکە ( قادرەمکەی) ی سـەر کەوتنە بەرەو سەروەری کە شەهید بوونە لەو رێگە پیروزەدا ، رێگەی خەباتی شورشگێرانەی جەماهیری بو روخاندنی فاشیزم وهێنانە سەرکایەی ئیئتیلاف و دیموکرات لە عیراقدا و بەدی هێنـانی ئوتونومی راستەقینە بو کوردستان و جێ بەجێ کردنـــی داخوازیە دیموکراتیەکانی جوتیاران و کرێکاران و رەنجدەرانی تر و خوێندەواران و هەموو بەشەکانی تری گەل

ئا لەو ساتە سامناکەدا کە جەللادەکان سەریان سورما لە قارەمانیتی و لە خوبوردوویی ئەم ٣ قارەمانە نەمرەی گەلە ـ کەمان کە مەرگ سەرشور بوو لە ئاست دلیری و جوامیری یاندا ، کە دوژمن توقی بوو لە گیانی شورشگێرانەیان ، داوای سـێ قارەمانەکەمان ئەوە بوو کە وتاریکیان لەسەر بنوسم ، بەراستی لێرەدا دەمەوی بلێم کە نووسینی وتارەکە نەک هەر بو ئەوەی کەس و کارەمان زیاتر شانازی بە خویانەوە بکەن دەردی شەـ هیدەکان لە نامەکەیاندا نوسیویانە بەلکو مایەی شانازی و سەر بەرزیشە بو من کە ئەو قارەمانانە لەو ساتەدا ئەم داوایەم لـێ بکەن بەلام داخەکەم وتارنا .. بگرە نامیلکەش ناتوانی هەقی پیاوەتی و فیداکاری و دلیری و جوامیری ئەو قارەمانانــــە و هەڤالە شەهیدەکانیان بداتەوە ، ئەم ٣ قارەمانە کە رولــەی دلسوز و بەوەفای جەماوەری کوردستان بوون کە شــــەرەفی پێشمەرگایەتی و ئەندامەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستانیان بـە تێکوشان و هەولدان بو خویان بچراند بوو ، ئەمرو ئــــەوان

ماموستای ئیمە مانانن ، دەرسی دلسوزیبوون ، هەتا سەر خوگرتن و نەبەزین تا دوا هەناسەی ژیان ، سەرکەوتن بە سەر دوژمندا دادەن بومان ·

. . . . . . .

ناچاریشمان دەکەن کە سەرلە نوی ، جاریکی تر بەلین بو گیانی پاکیان دوپات بکەینەوەکە هەتا سەر · کە تا دوا هەناسەی ژیان بەو پەری دلسوزی و لە خوبەشووردن و هوشیاریەوە ، لەسەر هەمان ریبازی شورشگیرانەی روونناك کراوە بە خوینی گەشیان دریژە بە خەبات بدەین بو هینانەدی هەمان ئامانج و ئاواتی ئەوان کە ژیانی بەنرخیان لە پیناویاندا بەخت کرد . بەلین بیت کە بی لادان و نووچدان هەتا زیندووین بجەنگین . شورشەکەمان دریژە پی بدەین تا دەگەینە دوا ئامانج . تا کورد ستانیکی ئازاد و بەختیار ، تا بەدی هینانی کومەلگای یەکسانی مروف دوور لە هەموو جورە زولم و زور و چەوسانەوەیەك ، ئیوەش ئەی ئازە مانەکان دلنیا بن لەوەی کە هەروەك دلی گەورەی نیشتمان ئیوەی جی کرد وتەوە لە باوەشیا دلی گەورەی گەلیش جیگەی کەس و کاری سەروەرتان دەکاتەوە ·

* جەلال تالەبانی *

نامەی ژمارە ١٧
شەهید : رەفیق مارف
بو .......

سەرمتای ژیان خەباتە ، مایەی خەبات سەرکەوتنـــــە ، شورشگیر ئەو کەسەیە کە لە دوا پلەی خەبات خوی ببینیتە وە ، شورش کاری جەماوەری گەلە ، گەلیش خاوەنی چەند یـــــن شورشگیر و تیکوشەرە ، هیچ هەورازیك بی سەرەو خوار نییە شورش کاریکی ئاسان نییە ، شورش هەلمەت و قوربانی وشکست و سەرکەوتن و نەوتان و سەرخستنە •

پیشەکی نامەم / سلاویکی کومونیستانە ••
تەنها ئاواتم ئەوەیە کە لیم ببووری و بە براکەی جارانـــم قبوول بکەنەوە و هیوادارم کە لیم ببووری چونکە بەراستی بـــوم دەرکەوت کە من دلی توم شکاندووە ، بەلام مەعلومە دەبـــی هەر برای گەورە بەخشندەبی لە ئاستی برای بچووك •

(( ••••• )) ی بەریزم ••
ژیانی روژانی شورش ئەگەر چی سەخت بوو بـــــە لام وا بزانم دل شکاندنت تەئسیری نییە چونکە ئاشکرایە شورش کاریکی سەخت و چرە بویە هەموو شورشیك سەر بەیەکەوە دەنین

(( ••••• )) ی بەریزم ••
ئیستایش وشە شیرینەکانت ، وشەکان کە هانیان دام تا دوا پلەی ژیانم خەباتم بدرەوشیتەوە ، هەر لە یادمە ••• لە یادمە لە جیاتی قەندیل ••لە هەورازەکاندا کە دەتـــووت :

شورش هەوراز و نشیو و فیدا بوون و قوربانی یە . بویە دلم ئیستاش لەبەر روشنایی وشەکانت کە وەك چرای رووناك وان ریگای خەباتم رووناك ئەکاتەوە . بە رووناکی وشەکانتان تەوقی شەرەف دەکەمە گەردن .

(( . . . . . )) ی بەریزم . .

ئەوەی کە من داواکاریم لیتان ئەوەیە کە بە پیشمەرگەم قبوول بکەن ، بە کوردیکی راستم دابنین ، وە هیوادارم گەلەکەم بە شەهیدیکی خویم قبوول بکات .

(( . . . . . )) ی بەریزم . .

بەراستی نازانم چون پاداشتی چاکەت بدەمەوە برادەران زور سلاو و ریزیان هەیە بوتان ، داوای سەرکەوتنتان بو ئەخوازم ، (( . . . . . )) گیان ، تکایە ئاگاداری خوت بکە لە کەسانی جوفروش و چلکاو خور ، ئیتر ئاواتەخوازم سەرکەوتوو بن بو خزمەت کردنی گەل و نیشتمان و ئەرکی میژوویی خوتان بەرنەسەر .

برای بچووکت
رەفیق عارف

مووسل / روژی لەخنکاندن
١٩٧٩/٤٤/٢٤

شەهید :ئاوات عمر علی
هەڤالی تیکوشەر (( ٠٠٠٠٠ ))

## بوچی ئاوانە گەر دیلی کەس نەبم
## یا پلیشاوەی ژیر هەرەس نەبم

سلاویکی شورشگیرانەی گەرم پیشکەش بە میللەتی کورد بە گشتی و بە توی تیکوشەر بەتایبەتی ، ئەی (( ٠٠٠٠٠ )) ی خوشەویست ، ئومیدەوارم هەر شاد و بەختەوەر بیتو جلەو گیری شورشە مەزنەکەی یەکیتی نیشتمانی کوردستان بکەیت بی وچان .

(( ٠٠٠٠٠ )) گیان ..

مروف کە گەورەترین شت ببەخشی تەنها گیانیەتی ، ئیمەی لاوی کوردیش ، هەر ئومەند مان لە تووانادایە کە گیانمان ببەخشین و گیان فیداکاری بکەین لە پیناوی ئەم خاکە جوانە و ئەم میللەتە هەژارەی کورد .

من هەر ئاواتە خوازی ئەوەم کە شورشە مەزنەکمان هەر لە گەشە کردنا بیت و بەرە و سەرکەوتن بروات ، تولە سەندنمان لە دوژمن بیر نەچیتەوە ، وە داواکاری من هەر ئەوەیە بە شەهیدیکی کورد بە پیشمەرگەیەکی دلسوزی کوردم دابنین .

(( ٠٠٠٠٠ )) گیان ..

ئیستا لە گەل هاوری مارف و چەند برادەریکی پ ٠م ی تر دا لە زیندانی سیدارە لە مووسل پیکەوەین وە هاوری مارف زور

سلاو و ریزی هــمیه ٠

دوژمن واد یاره کوتاییمتی ، بموەدا دمرئەکموی که زولم و زورداری زور زور زیادی کردووه ٠ توقاندنی زور زور زیــــادی کردووه و دوژمن له هیچ بارێکموه مه علوماتی نییه و ئیســـتاش نازانی ( کەر له کوی کەوتووه و کونده له کوی دراوه) ٠

ئیتر هیمەتی کەن بو رامالینی ئەم فاشیستانه له خاکی پیروزماندا

بەرەو سەرکەوتن
پ ٠ م :ئاوات عمر علی
زیندانی سیداره ــ موسل
١٩٧٩/٥/٢

نامەی ژمارە ١٩

شەهید : دکتور مارف (عثمان عبد الرحمن محمد)

١٩٧٩/٦/١

قەڵابچانەی موسڵ

بو مامی شورشگیر و بەندکراوم ‹‹...››

سلاویکی شورشگیرانە :

به هیوام سەرکەوتوو بیت لە خەباتی شورشگیرانەتـدا ، منیش زور باشم و تەنها چەند سەعاتیکم ماوە لە ژیاندا ، پاشان لە سیدارەی دوژمنی گەل‌دەدریم :

مامە گیان :

ئاییستا نامەم بو تەیارەتە روی نیازم با راستی و سلامەتی توی خوشەویستە ، بەلام بە بی ی زانین لەم چەنـد روژەی دواییدا لە ... دا ... بویە بە پیویستم زانی ئەم نامەیـەت بو بنیرم و چەند یەك شت لام کوبوتەوە بە پیویستی ئەزانم کـە بەریزت ئاگادار بکەمەوە :

- زور دەمیك بوو هەستم بەوە دەکرد کە تو لە ریکخستنی نهینی دا کار ئەکەی بەلام نەم ئەزانی ئەو ریکخستنە چ نـوعیکـە ؟ ئایا ریکخراویکی بورژوازی یە لە نەوعی کونە ریکخراوە بورژوازی یە لە کار کەوتووەکانی کورد ، یان ریکخراویکی کاول کاری یـە ، یا خود ریکخراویکی مارکسی ـ لینینی یە و ئەو ریکـخراوەیـە کە لەم دوواییانەدا من تیی گەیشتم و خوم لە پیناویدا بـە کوشت دا ، چەندان جار کە هاوریکانت ئەهاتن و کوبونەوەتـان ئەکرد زور بە وورایی سەرنجی ئیوەم ئەدا و ئەمویست بتـان

ناسم و بزانم کین ، چەندان جار خۆم لێ دانوساندن ئێوە منتان بە منال ئەزانی ، ئەوەندە گوێتان پێ نەئەدام تا لە ئەنجامی گوێ گرتن و هەڵسەنگاندنی قسەکانتاندا بۆم دەرکەوت کە ئێوە کەسانی دڵسۆز بە گەل و نیشتمان و کەسانی رەنجدەر و رەش و رووتن و ئەتانەوێ لە ڕێگای رەنجدەر و رەش و رووتی کوردستانەوە بە ڕوانین و کار پێکردن بە مارکسیزم ــ لینینیزم مەسەلەی رەنجدەرانی کوردستان چارەسەر بکەن ، هەر بۆیەش من کردم بە پیشە و هەموو رۆژێ کە ئێوە تێدا کۆ ئەبوونەوە وەختی خۆم ئەکرد بە دوو بەشەوە ، بەشی یەکەم چاودێری کولانەکان لە ترسی سیخورەکانی رژێم و کورد کوژ و غاشی یەکەی ئیستاکە من لە سەر بەتێ سێدارەی وەستاوم نەوەک بتان گرێ لە ماڵەوە و بەشی دووەمیش بۆ ئەوە بوو ناو بە ناو هەندێ لە قسەی کۆبوونەوەکەتی بکەم کە ئیستا لە زیندانەدا بەشیکو ـجێ بە جێ ئەکەم و ئەڵێم بەراستی مامە و هاوڕیکانی شتی باش لە ( مارکسیزم ــ لینینیزم ) وە فێر بوون و ئەتوانن لە هەموو کات و شوێنیکدا خۆیان بگونجێنن بەو پێیەی لە خزمەتی گەل و رەنجەراندان ،گوێم لێ بوو باسی رۆژانی لیدان و هەڵواسین و پلایس و سووتاندن و جوێنی بێ ئەخلاقانە و جۆرە رەفتاری سیخور و پیاوەکانی رژێم نابێ ورەمان پێ بەردا و نابێ قەد ناوی هاوڕیکانمان بدرکێنین ، مامە گیان ئەو وشەیەی ئێوە بۆ من بوو بە کولەکە و لە رۆژانی هەڵواسین و ئاگری جگەرە بە ملەوە نان و سووتاندن و پانکە و کارەبا و پلایس ئەم وشەیەم دەهاتەوە بیر ئەگەر ئیعتیراف بکەم سەر شۆری بەردەمی گەل ئەبم ، ئای مامە کە ناخۆشە پیاو ببەزێ لە بەردەمی ئەم دوژمنە ترسنۆک و مروڤ کوژەدا ، ئای چەند خۆشە کە سەر بەرز و

مامە گیان :
زورم گلەیی هەیە لیت ، ئەزانی بو ؟
لەکاتی پیش ئاشبەتال و پاش ئاشبەتال دەهاتـــەلات ، هانت ئەدام کتابی مارکسی ـ لینینی یانە بخوینمـــەوە ئەت ئەووت کە ریکخراویکمان هەیە بەناوی کومەلە کە پیك هاتووە لە خەلکی شورشگیر و دلسوزی ئەم گەلە ، هەر ئەتووت جاری بخوینەرەوە تا باش باش خوت پەروەردە ئەکەی ، لە بـــیرتـــە چەندان جار پیم ئەووتی باشە بوچی بخوینمـــەوە لـــــــە وەلامەکەتدا ئەتووت زور پیویستە مروڤ بخوینیتەوە و خـــــوی پەروەردە بکا و لە هەموو دیاردەکانی کومەلگاکەمان شارەزا و وەلامی هەبیت بو هەر دیاردەیەك بەلام نەت ویرا ئەوە ئاشکرا بکەی کە کومەلە ریکخراویکی مارکسی ـ لینینی یە و پیویستـــە هاوریکانی ئەم ریکخراوە باش خویان بە مارکسیزم ـ لینینیـــزم پەروەردە بکەن بو ئەوەی باش بتوانن لە شورشی رزگـــاری نیشتمانی دیموکراتی گەلی کورددا بەشداری و رابەری راستی شورش و جەماوەر بکەن ، لە گەل جەماوەر و بو جەماوەر کـــار بکەن ، ئەگەر زووتر تو کومەلەت بە من بناساندایە ئەوسا باشتر خوم پەروەردە دەکرد و پر چەکتر ئەبووم کە بەشداری شورشـــە چەکداریەکەی گەلم کرد ، کال و کرچی ئیستام تو بە گوناح بـار ئەزانم هەر بویە لە کوتایی ژیانمدا ئەو گلەییەت بەم چەند دیرە لـــی ئــەکـــەم .

نامه گیان :

که گلەییتان لی ئەکەم زور ممنوونم که مامیکی پـالەوانی مارکسی ـ لینینی وەك تۆم هەیه و هیچ گومانم نییه بوونم بـه کومەلەش سەرەنجامی بوونی تویه لە ریزی مارکسی یه لینینی یه کان دا له بەر ئەوه گلەیی و ممنوونیم روو بە رووت ئەکەمـــه وه هەر یەکه له تەرازووی خویدا •

---

تیبینی :

نامەکەی شەهید عوسمان شەش خاله ، سەبارەت بەوەی پینـــج خالەکەی تری پەیوەندیان بە هەندی نهینی شورشەوه هەیـــه بلاوکردنەوەیمان بو دەرفەتیکی تر هەلگرت •

## نامەی ژمارە ٢٠

شەهید : دکتور مارف (عثمان عبدالرحمن محمد)

١٩٧٩/٦/١٨

قەسابخانەی موسل

برای گەورە و تاکەکەسم .....

سلاوێکی گەرم ..

زورم پی خوشە سەرکەوتوو و سەربەرز و دلخوش و بەختەوەر بیت لە ژیانندا ..

١ ـ لەمرو بە دواوە چاوەڕێی دەقیقە و ساتی لە سیدارە دانیمن بەلام دلخوشبین بەوەی لە پیناوی مەسەلەی گەل و نیشتمانی کوردا ئەمرویں ..

کاکی بەریزم :

هەوالیکم بیگەیشت کە گوایە گیراوی بو جاری دووەم لە سەر ئەوەی کە جاسووس (.....) تو پیخند راوە ، بە راستی زورم حەزئەکرد ئەگەر تو بتوانیایە بیکوژی و گەلت رزگار بکردایە لە دەست جاسووسیکی ئاغەوها خوفروش بەلام دلنیام کە تسوی بەریزنیت بەلام دوژمن وا دیارە چاك زەندەقی لە خیزانەکەی ئیمە چووە هەر بویەش لە لایەك مامە قارەمانەکمانی لە بەندیخانەکەی ابو غریب توند کردووە و تو لە بەندیخانەی کەرکوك و منیش لە بەندیخانە و قەسابخانەی موسل ، بەراستی جیگای دلخوشی منە کە دوژمنی گەل ئەوەندە لە ئیمەی کورد بترسی .

براو هاوریم :

من شەهید ئەکریم بەلام ئیوە خوش بن ، کورد خوشیی مامم خوش بی ، هەژار و چەوساوەکانی ئەم گەلە خـــوش ، تەنیا غەمم ئەوەیە کە نەتوانی د ریژە بدەم بە خەبات کـــردن و نەتوانی خزمەتی تەواوتی گەل بکەم ، بەلام شانس وای هینا کە منی رولەی هەژارترین جوتیاری ئەم کوردستانە هەر ئەوەندەم بەر بکەوی لە خەبات کە خوم بەتی سیدارەی دوژمن بخەمـــە گەردن ، بە زەردە خەنەوە ئەو وتەیە بلیمەوە کە : ژیـــان زور خوشە بەلام مردن لە پیناوی ژیانی خەلکیدا لە ژیان خوشترە .

٢ــ حەز ئەکەم جاری هەوالی شەهید بوونم نەدەن بە دایکم لـــە بەر ئەوەی لە بەندیخانەی جنووبی رژیمە فاشی یەکەی ئیستای عیراقدا ناتوانی معاناتی ئازار و ئەشکەنجەی شەهید بوونـــی من بکات بویە کەی بەردرا و هاتەوە بو مالەوە ( ٠٠٠و ٠٠٠ ) بیبهیٔنن بو سەر گورەکەم و ئەوسا بلین مژدە لە توی هـــــەژار مارفی کورت لە پیناوی هەژارانی وەکو تودا شەهید بـــوو ، ئـــا ئەمەش گورەکەیەتی .

هاوری و برام :

زور بەممنون ئەبم خوگر و ئازا و نەترس و کولنەدەر بیت لە بەندیخانەدا ، هەر چەندە من ریگای ئەوە بە خوم نادەم کـە ئاموژگاری توی هاوریم بکەم بەلام وەکو شتیك کە ئەرکی هـــاوری یانەیە ئەیهینمەوە یادت ٠٠ ئەمما ٠٠ کە بە یەکەوە بـــاســـی خوگری و پالەوانیتی هاوریکانی کومەلمان ئەکرد و بە نموونـــە قارەمانیتی خالە شەهاب و جەعفەر و ئەنوەر زورا بمان چەند

به خوشی بەوە ئەگیرایەوە و چەندمان پێ خوش بوو کــــە ئەوان ئەوها ئازا و پالەوان و خوگر بوون ، وامان ئەزانـــی کورە ئازاکەی فلیمی سینەما ئیمە بووین . ئیستاش قارەمانیتی تو و من و مامم ئا ئەوها ئەبێت بە مایەی دلخوشی هاوریکانی تری کومەلەی رەش و رووتەکانی خەلکی کوردستان .

سلاومان هەیە بو هەموو برادەرە پالەوانەکانی لای خوتان هاوری مەلا عەلی زور ریز و سلاوی هەیە .

ئیتر خوشیتان

هاوریت و برازات
د. مارف عبدالرحمن
١٨ / ٦ / ١٩٧٩
قصابخانەی موسل

## نامەی ژمارە (٢)

شەهید : لەتیف حەمە صالح دەولانی

شەوی $\frac{١٩}{٢٠}$ /٦/ ١٩٧٨ دوا ڕۆژم

با بجەنگین دژی زورداران لە هەرکوی هەن ..
بو هاوڕێی بەڕێز و بە نرخم کاك (( .....))

بیشەکی جوانترین سلاوی شورشگیرانەت ئاراستە ئەکەم بو توی شورشگیر و نەبەز ..

تیبینی :

شەهید لە سەرەتای نامەکەیدا باسی چونیەتی گرتنی ئەکات ، لە گەل سەربازیکی تردا کە ناوی (( .....)) ە ریك کەوتبوون بچنە سەرەوە .. ئەو روژەی بریار وابوو لە جیگایەکی دیاریکراو دا بە یەك بگەن هاوری کەی خیانەتی لی کرد بوو بویە لە لایەن (( ئیستیخبارات )) ی عیراقی یەوە گیرا بوو ، و یەکسەر حوکمی ئیعدام و گولله باران کردنی دەرچوو ، ئینجا لە نامەکەیدا ئەلی :

هاوری دلسوز ..

دلنیا بە گرنگ نییە لام ئیعدام و رەمی ، ساوار دەکەم و دەقیژینم بە سەریانا ئەی فاشی یەکان گرنگ نییە بەلامەوە لە کوی ئەمرم ، گرنگ ئەوەیە گویم لە دەنگی شورشگیرەکان بی کە ناهیلن چەوسینەر و فاشی یەکان لە سەر گیانی هەژار و بی دەسەلاتەکان بژین .

کاك (( . . . . . )) ی شورشگیرو قارەمان :

هەرگیزا و هەرگیز بیرم لە لیدان و سزا و رەمی نەکردوتەوە وە هیچ جورە ئیعتیرافیکم نەکردووە ئەوە تەنی ووتوومە بە ئیجازە هاتووم و سەرلە براکانم و دایکم بدەم ، بو دەمانچەکەش ووتم بویە پیم بووە دیفاعی نەفسی خومی پی بکەم .

هاوری‌ی تیکوشەر :

روژی مواجەهەی ئەخیرم دەستم کرد بە لیدانی هوتاف دژی حوکمەتی فاشیست و ( فانیلەیەکی سپی بلوس) م کری لە بەر خاتری ئەوەی کە لیم نووسیوە :

عاشت الحرکە المارکسیە اللینینیە فی العالم .

گوی بگرە :

نامەوی ئەو ژینە لای بە بوچیمە

ئەمەوی بمرم

بو هەژارانی ئەم جیهانە

ژینی ژیردەستە بو من نابی

ساحیب شەرەفم ، مردن ئەموی

هاوری گیان :

هەر بە دەم خەندە و پیکەنین و گورانی شورشگیرانە خوم دەخەمە بەردەم گوللەی دوژمنی نارەوا ، گوللەکانیان بە حەلاتەوە دەنیم و وەریان دەگرم ، چونکە مایەی شانازی بەرزیمە مردن .

برا گیان :

هیوادارم هەر لە سەنگەری پیشەوەی خەباتدا بیبیتەوە

هەمیشە پشکوی تولە بیت بو شەهیدان وە هەرگیز سەنگەر چول نەکەن بو دوژمن .

برا گیان :

خوم زور بە ماتمین دەزانم کە برایەکی وام نییە دەستی بداتە چەکەکەم تاکو تولەی خوینی برای شەهیدی و شەهیدانی تر بکاتەوە .

هاوریی تیکوشەر :

بو خوت دەزانی کە مالی ئیمە کزن . تواناى هیچیان نییە ، دەبی ئاگاتان لی بی وە هەردەم ئاگاداری برادەران بکری بە نهینی یەوە بی یان لی نەبرن . ئاگاداری براکەم بکەن و هەردەم نەسیحەتی شورشکردنی بو بکری وە هەردەم بانگی مارکسی - لینینی بە گویدا بدری تاکو فام دەکاتەوە و دەبی بە خزمەت کەریکی ئەم میللەتە وە خوینی بجولی بەو تولە سەندنی خوینی شەهیدان ، هیوادارم ئەم وەسیەتەم بو جی بەجی بکەن و ئەو برایەم بو بی بگەیەنن .

برای شورشگیر :

خوا حافیز بەرەو گورستانی غەریبی شەهیدانی نەبەسەز . سلاو و ریزم بو هەموو هاوری یانی پیشمەرگەی تیکوشەرە رەرق ئەستووری تولەیان ئاواتمە .

ئیتر بو پیشەوە لە ژیر پەیرەو کردنی ریبازی مارکسی - لینینی

هاوریتان

لەتیف حەمە صالح دولانی

لە ژیر چەپوکی نارەوای بەعسی فاشست

## نامەی ژمارە ٤٤

شەهید : محمد حمە سەعید

٢٧/٦/ ١٩٧٩ / زیندانی سیدارەی موسل

بەناوی خوای گەورە و بەخشندە و میهرەبان

سلاویکی شورشگیرانە ..

پیشکەش بە هاوریی تیکوشەر کاك (( ..... ))

پیشەکی نامە سلاویکی گەرمت ئاراستە ئەکەم کە گەرم تر بی لە گەرمترین روژی هاوین ، وە فینك تر بی لە هەوای سەر چیاکانی کوردستان ، وە بە پەغمە تر بیت لە ئاوازی بولبولان وە بە سوزتر بیت لە دلی دایکیکی جەرگ سووتاو ...

تیبینی :

نامەکەی شەهید کاکە محمدی حمە سەعید زور دوور و دریژە ، لە سەر چەند پارچە کاغەزیکی پاکەتە پاقلاوە و پاکەتە جگەرە نووسراوەتەوە تیایدا بە ووردی تیشکی خستوتە سەر چونیەتی گرتنی و ئەو کەسانەی بوونەتە هوی گرتنی ، ئینجا باسی جوری لیکولینەوە دەکات لە ژوورەکانی ئەمنی سلیمانیدا سەبارەت بەوەی زوربەی ئەو زانیاریانەی لە نامەکەدا ن هیشتا کاتی بلاوکردنەوەیان نەهاتووە . ملای خومان هەلمان گرت بەو هیوایەی لە یارو دوخیکی لە بارا وەك خوی بلاوبکریتەوە .

## نامەی ژمارە ۴۳
### شەهید : مەلا زموقی ( رەزا ئیسماعیل )

هاوریی بەریز کاك (( . . . . . )).
سلاویکی شورشگیرانەت پیشکەش ئەکەین .

هاوریی بەریز ، کانگای دلی هەموو لاویك دلی بە خەبات خوشە ، دلی بە ژیان خوشە ، دلی بە خزمەتی گەل خوشە ، سلاوی پیروز ئاراستەی بەریزت ئەکەم هیوادارم هەموو کات ریرەوی راستەقینەی شورش بی و زیاتر گەشە بدەی بە بیر و باوەری (م . ل ) لە هەموو کون و قوژبنیکی ناوچەکە و سەرتا سەری کوردستان ، ئاواتی من گەشەدان بە شورش و خزمەتی گەل بووە ، پاراستنی کەرامەت و شەرەفی خەلك بوە .

هاوری گیان :

زورمان لا پیروزە کە ئیمە ئەم دوژمنانە دەمان گرن و دەمان کوژن و دەبنە هوی هاندانی هەزاران لاوی تازە و ئاگر تیبەردانی دلی هەموو کەسیکی دلسوزی کورد تا زیاتر و بە دلیکی سافەوە لە سەنگەری شەرەفدا دانیشی و پاریزگاری بکات لە مافی نەتەوەکان .ئیمە هەمووان لەو روژەوەی چەکمان کرد ، شان لیمان روون بو دەبی بمرین لە پیناوی گەل و قوربانی بدەین تا خەلکی پیروزی کوردستان بکەونە ئیسراحەتەوە ، شتیکی زور روونە کە شورش لە خوینی ئیمە و چەند ەها کەسی تر خوشنابی و ئەو میللەتە بەقارەمانی خویان خوینی ئیمەیان لە نیو چاودایە و بە هیچ جوری لیی خوش نابن .

هاوری گیان :

بەرەی میللەتەکمان همو کات سەرکەوتووە ، ئینجا ئـەم سال بیت یان چەند سالی تر ، ئیمە داوا ئەکەین لە هموو دلسوزیکی کورد تولمان بسینی و بە هیچ جوری واز لـە خوینی هەزاران لاوی وەك ئیمە نەهینی .

ئیمە بەوپەری وزەی بەهیز و بە شانازی تەواو و بە ختەوەری تەواو پەتی رزگار بونی نەتەوەکمان دەکەینە مل و چـاوی دوژمنی پی ئەشکینین ، و بە وتنی سروودی نیشتمانـی و هاوار کردن دژی ئەم درندانە و وتنی بژی شورش کاسیان دەکەین تا باش بزانن ئیمەش نەبین میللەت تولمیان لـی دەسینی . یا ئیمەش وەك ئەو شەهیدانەی تر وەك خالـە شەهاب و ماموستا جەعفەر و کاك ئەنوەر و ماموستا عەزیـز شەهید بین و خاکی پیروزی کوردستان بە کوری خوینمـان قـبول کـات .

جمالە رەشی نەمر دەلیت :
کریکاریکی کوردی جەسوورم
خەبات کەریکی لەشکری سوورم
شورشگیری یە ریبازو بیـرم
پیشرەوی چیتم بویە وا گورجم
ئیمەش بە ئاواتەوەین بچینە گورستانی ئەم شەهیدانەوە و جیگامان لە تەنیشتی ئەوان بیت .

برای بەریز ؛
ئیمە سێ کەس بووین کە بە ئیش و کاری شورش هاتینــە دێی قزلەر ، ئیوارە چوینە مالیك بەلام دوایی گویزامانە وە مالیکی تر و لەوی ماینەوە لە سەر سیقەی خاوەن مالەکــە و زور تەئمینی کردین کە بخەوین بوخومان هیچ شتی نیە ۰ ئیتــر نازانین شەو سەعات ( ١١ ) دەنگە دەنگ پەیدا بوو ، مــن چومە دەرەوە ، یەکسەر دەوریان گرتم و دەستیان بەستــم ، ئیمە تەئمین بوین پاشان (( ۰۰۰۰ )) وەك من هاتە دەرەوە و بە ناوی جماعتی(( ۰۰۰۰ )) وە توانیان بمانگرن ، ئینجــا بە راستی نازانم ئەو جاشە بەد فەرانە چون گەیشتنە ئــەوی و ئیمەیان بەمجورە دوزیەوە ۰

ئیتر بەریز ، سلاو ڕیزم هەمو کات پیشکەش بە هەموو بــرا دەریکم ئەکەم کە هەوالم ئە پرسیت ، بە هەموو دلسوزیکــــی نەتەوەی کورد ، ئاواتی من تەنها هەلگرتنی چەکی شەرەفــە و پاراستنی مافی خەلکە بەلام ئەم درندانە زور بە زوویی لــی یان داین و نەیان هیشت خزمەتی زیاتر بکەین ۰

ئاواتمان سەرکەوتنی ئیوەیە و پیشکەوتنی ئیوەیە و دلخوشی دانەوەی دایك و باوکانە و یارمەتی دانیانە بو ئەوەی بە هیچ جوریك وا بیر نەکەنەوە کە کوریان هەبوو ومیان مردوە بەلکــــو هەموو کات بیریان بخەنەوە کە بە شانازی یەوە بیرمان بکەنەوە ۰

بەریز ئیمە نزیکەی (٤٨) کەسین کە ئیستا لــــە ژووری ئیعدام داین ، هەموو مان ورەمان بەرزە و بە هیچ جوریــك

ترسمان نییه ، هەموو برادەران سڵاویان هەیە بوتان ، ریزیان هەیە بوتان ، قەت وا بیر نەکەنەوە گوایە ئیمە مردوین ، زیاتر خەڵك هاندەن بو خەبات و زیاتر ریزەکان بە هێزکەن .

لە کوتایی دا سڵاوم بگەیەنە بە هەموو کوردستان و هەموو پیشمەرگەکان .

بژی شورش !

بمری فاشیست !

بروخی دوژمن !

هاوری و دلسوزتان هەتا هەتایە

مەلا زموقی

مووسل ١٩٨٠/٧/١

نامەی ژمارە ٤٤

شەهید : مەلا زەوقی

بەریز و تیکوشەر کاك (( ٠٠٠٠٠ ))
سلاویکی شورشگیرانە ٠٠

پیشەکی نامەمان بەریز بە دوری لە ئیوەی بەریز و ئـــە و شورشە پیروزەی کە حەباتی بی وچان دەکات لـــە پینـــاوی بەدی هینانی ئاوات و ئامانجەکانی گەلەکمان بە هەمو چینە شورشگیرەکانیەوە ٠

لەم دواییەدا شورشە مەزنەکمان سەرکەوتنی گەورەیان بە دەست هیناوە ٠ روژ بە روژ دوژمنەکانیان یەك لە دوای یەك تیك شکاوە وە بەگەورەترین محاوەلە نەیتوانیوە ئەو وزە شورش گیری یە لە گیانی ئیوەی قارەمان و میللەتەکمان دەربکـــات، بەوپەری شانازی و بە ختەوەری یەوە سەری ئیمە و هەمو چە وســاوەیەکی کورد ستانتان بەرز کرد وتەوە بە تایبەتی هەریمـــە قارەمانەکەی ئیوە وە ئەو پیشمەرگە قارەمانانەی بی وچان وەك درنك بەرچاوی دوژمنتان گرتوە ٠ بەریز بە پیروزی ئیوە یـــەك لە دوای یەك و هەولدان لە پیناوی وەرگرتنی هەمو مافی ئە و رەش و روتەی کە دەنالینی لە ژیر زەبر و زوری فاشی یەکانـــی بەغدا ، بە راستی دەست وەشانەنی ئیوە و بەرد هوام بـــون لە سەر تولە سەندن بو ئیمە ، بو هەمو هاوری یەکی تر و بـــو کەس و کاری ئیمە خوش کرد وە بەو پەری دلفراوانی و گیانی کوردانەوە لە روژی مواجەهەدا لە موسل لەگەل ئیمە دەدوین و

باسی ئیوەی قارەمان دەکەن کە ئێوە هیچ جۆرێ وازتان نەهێناوە لە مافی ئیمە و گەلەکەمان بەئێمە قاوات و قارەزووەکانی دەوی دەمانەوی وزەی ئەو جەماوەرە بەرز بێتەوە ، ئیمە ئەو رۆژەی چەکمان کردەشان زۆر باش زانیمان کە لە ریگەی شەرەفی میللەتەکەمان بمرین وە ئەوەش لەو دەرکەوتنەوەیە کە خەباتی ئەمڕۆی گەلەکەمان پێیدا ئەڕوات دەمی بیباش بزانین هاتنمان بۆ زۆری سیدارە جێی غەم و بەزارە نییە مادام ئێوە هەن و میللەت هەیە بە هیچ جۆرێ ئیمە نامرین و هەموو کاتە ئاوێن و دەرکی جاری فاشی یەکانین .

بەریزان :

ئیمە خەباتی رەوای گەلەکەمان زۆر بە پیرۆز دەزانین و بە هیچ جۆری کوڵ نادەین هەتا ئەو دەمەی پەتی سیدارە ئەمان تاسینی وە بەو بەری بەختەوەری بەوە ئەو پەتە دەکەینە مەلی دوژمنەکانمان چونکە زۆرباش دەزانین دوژمن لە پەلەقاژەدایە وە پشتی کەوتوە لە زەوی .

بەریزان :

ئیمە ( ٢٥ ) کەسین وە ئیستا ماوەیەکی زۆرە جماعەتێکمان لێرەن وە ئیمە لەم دواییەدا حوکم دراین بە ئیعدام بەلام هاووری یانی کۆمەلەی تیکۆشەر و یەکێتی نیشتمانی کوردستان بە دەم ئەمانەدا کە ژمارەیان دەگاتە دەوری ( ١٣ ) کەس کە هاوڕێی خومان و لە ناوچەکانەدا گیراون .

بەریز کاك (( ..... )) :

دەمەوی لیرەدا بوتی رون کەمەوە چونیەتی گیرانی ئیمە :

بەریز ئیمە لە مالومەوە هاتینە قزلەر لە گەل (( ٠٠٠٠٠ )) و (( ٠٠٠٠٠ )) وە ئیوارە لە قزلەر لە مالیك نانمان خوارد ، مالی (( ٠٠٠٠٠ )) ، پاشان لە دەوری سەعات ( ٨ ) لەوی دەرچوین چوینە مالیکی تر ، مالی (( ٠٠٠٠٠ )) ، دەوری سەعات ( ١١ ) کە خەوتبوین وە لە مالەکە ئەمین بوین وە هەروەها (( ٠٠٠٠٠ )) وتی بە هیچ شیوەیەك ئیوە خەمتان نەبیت خوم حەراسەتی ئیوە دەکرم ، ئیمەش لەوە ئەمین بوین و وتمان لە مالی ئەوان دەخەوین بە ئەمینی پاشان دەوری سەعات ( ١١ ) دەنگە دەنگ پەیدا بو وە ( ٠٠٠٠٠ ) چوە دەرەوە وە دەستی کرد بە قسەکردن لە گەل جاشەکاندا وە وتی لیرەنین بەلام جاشەکان تورە بون لە (( ٠٠٠٠٠ )) وتیان لیرەن دروئەکەی (( ئیتر ئەوەبو یەك یەك گیراین )) ٠

بەریزان :

ئیمە و هەمو هاوری یان بەوبەری ورەی بەهیز و بی ترسەوە ماینەتەوە لە ژوری سیدارە ، وە مواجەهە بە مواجەهە خەلکی قارەمانی کوردستان پول پول رود ەکەنە موسل وە بەو پەری چاوقایمی و چاوی تولە سەندنەوە رود ەکەنە دوژمنە فاشستیەکان بی ترسن لە هەمو ناخوشی یەك وە ژمارەیەکی یەکجار خەلکی زور نزیکەی چوار هەزار یان ( ٣٥٠٠ ) کەس دینە مواجەهەمان وە بە راستی خەلکی بە شەرەف چاکمان لی دەپرسنەوە وە هەمو توانا یەکیان سەرف کردوە لە پیناوی بەرەلا کردنی ئیمە ٠

بەریزان :
ئاگامان لە ئیوە سەندنی مافی ئیمە ، وەرگرتنی خوینی ئیمە وە لەناو بردنی دوژمنی ئیمەیە .

لە کوتاییدا سلاوی شورشگیرانە بو هەمو هاوری یان یەك بە یەك وە بو هەمو پیشمەرگە تازەمانەکان یەك بە یەك هیوادارم هەر لە سەرکەوتندا بن . .

بەریزان :
چەندە ئیوە لە ئیمە بپرسنەوە ، چەندە سەرکەوتن بسەدی ببینن ، کەس و کاری ئیمەی پی شاد دەبیت وە بی ی بەرزتر دەبنەوە لە کوتایی نامەدا ئاواتە خوازم سەرکەوتوبن ، پیش کەوتوبن ، وە سەرکەون لە شورشە پیروزەکەماندا ، بەریزان ئیمە چاوەری ی هەول و تیکوشانی ئیوەین ، ئیتر هەر لەری ی خەبات و تیکوشان بو سەندنی مافی رەوای گەلەکەمان .

بژی شورش . . بژی خەبات . . بژی تیکوشان . . . . . بمری دوژمن . . .

ئیتر بو پیشەوە لە ژیر ئالای ( ك . ر . ك )وە( ی . ن . ك )

هاوری ی دلسوزتان
مەلا زەوقی
ژوری سیدارە

نامەی ژمارە ٥٢
شەهید ... پیروت

کوردستان یان نەمان
یەکیتی نیشتمانی کوردستان

برای گەورە و بەریز و خوشەویستم کاك ((. . . . . . . . ))
پیشکەش بیت .

پیشەکی سلاویکی شورشگیرانەتان پیشکەش ئەکەم وە لـــە هەوالی ساغ و سەلامەتیتان دەپرسم وە هیوام خوشی هەموو لایەکتانە وە ئاواتە خوازم بە زووترین کات ئەتەومکەمان بەمافی رەوای خوی شاد بیت .

کاکی خوشەویستم :

برادەرانی ئیرە کە (٢٨) کەسن سلاوت لی دەکەن ، سلاو لە هەموو برادەران دەکەن .

هیوادارم جاریکی تر بتبینمەوە بەلام کە ئەشکرا داوا ئەکەم کە هەمووتان گەردنم ئازاد بکەن و دوعای خیرمان بو بکەن .

جا کاکە هیوادارم هیچ خەمی ئیمەتان نەبیت چونکە ئیمە دەروین بەلام سەدان دینە جیگەمان بو ئیمە ئەومندە بەســـە کەوا لە زووری ئیعدام ناوی خومان لە خوار ناوی ماموســـتا عزیز و کاك مارف و شەهیدانی تر نوسیوە .

ئەمەوی زورت بو بنوسم بەلام مەجال نییە ، ئەوەندە هەمیە وەکیلی سلاوان بە بو برادەران . ئیتر خوشیتان دەخوازم.

٢٩ / ٦ / ١٩٨٠
٣٠

## نامەی ژمارە ٤٦
## شەهید : دکتور ریباز ( ابراهیم محمود محمد )

بەریز کاك (( ٠٠٠٠٠٠ ))
سلاویکی شورشگیرانە ،

سلاوی پیروز ٠٠٠ هەوالی پیروز ٠٠٠ شورشی پیروز ٠٠ ووتەی پیروز ٠٠٠ ئە مرو خەباتی چەوساوەی گەل هە مووی بە جاری زیاتر هەنگاومان پێدەنی ، زیاتر دە مان جولینی تا دوژمنمان زیانیان نە مینی ٠

کاك (( ٠٠٠٠٠٠ ))

ئاواتی من تەنها رزگاری گەلە و چاك بوونی ریزەکانی گەلە وە زیاتر گەشەدان بە ریرەوی راستە قینەی ( م ـ ل ) و گەشەدان بەو خەباتە روژ لە دوای روژ ، خەباتی چەوساوەی کورد ـ ستان روژ لە دوای روژ بەرە دەستینی و هەنگاوی گەورە تر دەنی بەرەو ئاسوی رزگاری و ئاسوی درندەکان زور بە باشی دەرکیان کردووە کە شورشی ئە مجارە مان بەی ناوەتە نیو خەباتی جەماوەرەوە ، لە ئاوات و هەستەکانی جەماوەر بە دوور نییە وە گەشەی داوە بە هە موو جولانەوەکانی عیراق تا زیاتر هەنگاو بنین بەرە و ترویکی رزگاری . ئاواتی من ریسك خستنی پیشمەرگەی کوردستانە لە سەر تازەترین شیوەریکخستنی خەلکی بەشەرەفە ٠٠

بەریز : ئیمە بە هیچ جوری لە خەبات کول نادەین وە زیاتر سوور دەبین لەسەر مافی گەلەکە مان ، سجن و ئیرها ب بەرهەمی تەنیا ئازادی بو گەلە ، لیدان و کوشتن ئامانجی

بەدی هێنانی گەلە ٠

ئێمە بەوپەری شانازی یەوە خومان ئامادە کرد ووە خاکی پیروزی کوردستان قبولمان کات بە کوری خوی ، باوەشمان بو بکاتەوە وەك ئەو شەهیدانەوە داوا دەکەین لە چەوسساوەی کوردستان بە کوری خویمان قبوول کات و تکاشمان ئەوەیە ئێوە زیاتر سوور بن لەسەر مافی رەوای گەلەکەمان چونکە دوژمن بە تەواوی ورەی بەرداوەوە دەستی کردووە بە دوزینەوەی هەموو جورە ئوسلوبێك تا بو ماوەیەکی کاتی ی خەلکی پیوە گیر کات ، بە هیچ جوری دەستی جە ماوەر وازی لی ناهینی وە زیاتر دابراوە لە خەلکی عیراق ٠

کاك (( ٠٠٠٠٠ ))

تکامان جیبەجیکردنی نامەکەی پیشووەکە ناردمان بوت لە بارەی هەریمی چوارەوە ٠٠٠٠٠ ٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠ هتد ٠

بەریز :

ئیمە کە لە موصلین نزیکەی ( ٤٨ ) کەسین لە سجن ، وە هەموومان زور بە ریزەوە بەوپەری توانا و هیزەوە خومان ئامادە کردووەتا دوژمنان کویرکەین ، زیاتر سوور بین لەسەر داوا رەواکمان زیاتر خومان قورس‌کەین وە بە راستی خومان بە کوری کومەلە و شورش‌بزانین ، وە ئەو دړندانە با باش‌بزانن بە هیچ جوری بە کوشتن و برین خەباتی گەل کول نادات و شکستی ناهینیت بەلکو زیاتر خەلکی بەشەرەف پەنای دەگرن و یارمەتی بە شیوەی سەرەکی دەدەنە شورش ٠

کاك (( ٠٠٠٠٠٠ ))

ماوەیەکی یەکجار زور ماینەوە لە هەیئە بو ماوەی شەش مانگ

پاشان حوکم درابن و رەوانەی قەسابخانەکەی (مووسڵ) یان کردین . ئێمە هەموو ورەمان زۆر بەرزە . دوژمن بە تەواوی سەری سوورماوە لەم بەسەرهاتانە و بە هیچ جۆری ناتوانی خۆی بگۆڕی لەبەر شاڵاوی بەهێزی میللەتدا . تکامان لە ئێوە یادمان کەنەوە و لەبیرمان مەکەن وە هەموو کاتێ یادکردنەوەمان بریتی بێت لە دڵدانەوەی هەموو لایەك وە هاندانیان بۆ لەبەرکردنی جل و بەرگی پیرۆزی جلی سوور ، جلی رزگاری ، کە پێیانی بڵێن کە ئێمە نەمردووین وە تا ئەو رۆژەی رۆژی ئازادی گەل هەڵدێ وە ئەو کاتە ئاوات و ئامانجەکانی ئێمە دێتە دی ..

ئێمە ئەو رۆژەی چەکی شۆڕشمان کردە شان ، زۆر چاك خستمانە پێش چاومان کەمردن لە پێناوی گەلدا ! شتێکی زۆر پیرۆزە ، بێ ترس بەرە و ئەو مردنە هەنگاو دەنێین ...

کاك (( . . . . . )) ی بەرێز

(( مەحوی )) نەمر جوانی وتووە :

بەرەو پیری مەرگەوە فەرسەخ بە فەرسەخ رۆیین مەردانی
ئەوەی باکی لە مردن بێ دیارە بلح و نەشامەردە

ئێمە بە هیچ جۆری باکی مردنمان نییە وە بەوپەری شانازیەوە دەینێینە ملمان وە بە فەخری دەزانین کە تەتەوەی کورد دەمان کاتە نوێنەر بۆ رزگاری چەوساوەکان وە داوا لە خاکی پیرۆز دەکەین کە بە شەهیدی خاکی پیرۆزی کوردمان وەرگری .

بەراستی هەموو برادەران وێنەیان کەمە ، یەك بە یەك دڵخۆشی یەکتری دەدەنەوە ، زیاتر ورەی بەرز دەکاتەوە ،

هانی ئەدا کە دلخوشی کەس و کارمان بد مینەوە کە مرد نەکەمان پیروزە و کە م کەس ئەو مرد نەی ئوش د مبیت کە ببنە گولیکی سوور لە ریزی خالە شەهاب و جە عفەر و ئەنوەر ..

داواکاری ئیمە لەوان ئەوەیە ورەیان بەرز بیت ، بە هیچ جوری خەم نەخون .

گاك (( .... )) :

حەزم دەکرد بە ورد ی شتی زورت بو بنوسم بەلام لە بەر ئەوەی ماوە نەمتوانی هەموو شتیکت بو روون کەمەوە بەلام ئەبی لیمان ببورن کەوا بە زووترین کات گیراین و نەمانتوانی لە سەنگەری شەرەفدا زیاتر بمینینەوە تا زیاتر خەبات کەین ، ئاواتە خوازین بچینە هەموو شەهیدانی ریگەی رزگاری و چەوساوەی کورد .

بەراستی ماتەوەمان لە هەیئە قیری هەموو جورە خوراگرتن وە خەباتی نویی کرد بین .

هەروەها خوشکە (( .... )) کە تاقە کچی شورشگیری کورد ە لە هەیئە ( مەبەست هەیئەی سیخوراییەتی و لیکولینەوەی کەرکووکە ) باش توانی بو دوژمن ئیسباتی کات کە ئیمە ئافرەتی شورشگیرمان هەیە ماوەی سێ مانگ مایەوە بی ئەوەی یەك وشە ئستیفادەی لی بکەن .

ئیتر بو پیشەوە لە ژیر ئالای سووری کومەلەدا

بژی شورش ، بژی سەرکەوتن ، بمری فاشست

هاوریتان : دکتور ریباز

زووری سیدارە ، دووشەممەی ۳۰/۶/ ۱۹۸۰

## نامەی ژمارە ٢٧

شەهید : دکتور ریباز

سلاویکی پیروز بو هەموو شورشگیران

لە شجنەوە : بو هەموو شورشگیران

سلاویکی شورشگیرانەی گەرم لە ناخی دەروونی هەموو بێ کار و چەوساوەیەکی (م٠ل) و بە جێ هێنانی ئاوات و ئارەزوەکانی چینی چەوساوەی کورد

هاوڕێی بەڕێز کاک (( ٠٠٠٠٠٠ )) :

شورشی نویی ئەمجارمان روژ لە دوای روژ هەنگاوی بێ وچان ، هەنگاوی دلێرانە دەنێت بەرەو خەبات ٠٠٠ بەرەو تێکوشان ٠ئێمە ئاواتمان ئاودانی داری ئازادی گەل بوە ، مەبەستی سەرەکیمان رزگاری گەل بوە ، بە هەمو جورێك دەمانەوێست ئاگری خەبات لە دلی هەمو لاوێکی کوردا جوش بدەین و تینی شورشگیرانە زیاتر گەشە پی بدەین ، ئێمە ئەو روژەی کە چەکی شەرەفمان هەلگرت ، زانیمان مردن سەر بەرزی تێدایە راستە (ژیان خوشە بەلام مردن لە پێناوی گەلدا خوشترە ) ٠

ئێمە هەمومان نزیکەی ( ٤٤ ) کەسین بەوپەری خو ئامادە کردن ، بەوپەری هێز و توانامانەوە ، ئەم دوژمنە فاشی یانە کوێر ئەکەین وەباش بویان دەرئەخەین ، خەباتی گەلان بە مانە کوتایی نییە ، بەلکو بەهێزتر دەبێت و گەشاوەتر دەبێت شەهیدی نەمر (جەمالە رەش ) پێشمان دەکەوێت و دەلێت :

شههید بوون، کاروان له رهوتایه
سهربهرزین و سهشخهلمان له گردایه

ئیمه لهو روژهی کهوتوینه ته ژیر دهستی ئهم فاشی یبانه به ههمو توانایانهوه نهیان توانیوه بچوکترین خال سود لــه ئیمه وهربگرن ، به هیچ جوریك نهیان توانیوه زال بن به سهر مـانـا .

بهریزان :

تکامان سوك کردن و ریسواکردنی ده ست و داٸیرهی ئهم فاشی یانهیه ( رهسم کردن له شهرو وهزعی ههیئه خاصه و بلاو کرد نهوه به کتیب پاشان فهسا بخانهکهی موسل ) به راستــی ئوسلوبیان بوگهنه .وا بو ماوهی شهش مانگ ماوینهوه لـــه ( ههیئهی کهرکوك ) ، پاشان بو موسل ، شارهزای ههمو ههــ لس و کهوت و معاملهیان بوین و زور به تهناعهتهوه دهلیـــم روژی له ناو چونیان هاتوه ، چونکه که دهمان بهن بـــــو (ئیفاده ) لیمان دهپرسن که شا روخا له ئیران ئهو کهسانهی پیاوی شا بون چیان بهی دهکردن ، تهنیا دهیان کوشتن ئیمهش له وهلامدا پیمان دهوتن نهك کوشتن بهلکو به گـــاز گیاتیان دهبچرین ، بهتایبهتی مهسئولی سجنهکان به هیــچ جوری لی خوش بونیان نهبوه ، ئهمه باشترین نمونهیه کـــه ئهمانه تهنها ههل به دهستیا تهوه گرتن و کوشتن به تیکرایی وه ههمو کاریه دهستیکیان به تهواوی بروای به خوی نهماوه نــه ك به حیزب و دهولهت .

بهریزان :

بو ماوهی شی مانگ زیاتره کچیکی تیکوشهر به ناوی( ... ... ) له ههیئه بو ، پیسترین ئوسلوبیان به کار هینـا

بو ئیعتیراف پیکردن ، به هیچ جوری ئەیانتوانی تەفسیری تی بکەن. وەك قارەمان خوی راگرت ، به راستی ئازایی ئە و کچە کورد ە و لیهاتویی زیاتر ورەی ئیمەی بەرز کرد ەوە و زیاتر هانی ئەدایین ، بەریزان هەمو مەحکومەکان ( هاوری یان ) بەو پەری بەتوانایی و لی هاتوییەوە چونتە مەحکەمە بە پیکەنین و روی گەشەوە چونە بەر چاوی جەلادەکان . بەریزان( ٤٤ ) کەس حوکمی ئیعدامین لە موسل .

دارى ئازادی بە خوین ئاو نەدری قەت بەرناگری
سەربە خویی بی فیداکاری ئەبەد سەر ناگری

پیکەسی نەمر راستی وتوە ، خاکی پیروزی ئیمە پیویستی بە خوارد ن هەیە ، پیویستی بە ژیانەوە هەیە .

بەریز کاك (( ..... )) زور نەمایەوە لە ژیان
تا د روست کەین نیشتمانی نوییمان
دوژمن هات بە هیزی نوی یان
هەتی وەران گولی بەهارمان

ئیمە بە هیچ جوریك ریگەی پیروزی خومان لە بیر نە چوە وە زیاتر چەسپاوترین وە زیاتر خوراگرتر بوین بەلام تکای ئیمە ئەوەیە یاد مان بکەنەوە بە نوسراو وە هەمو کات چونیەتی معامەلەتی ئەو فاشی یانە بە رەسم و بلاوکراوە بلاوکەنەوە ، ئیمە هەول دەدەین ببین بە یارمەتی دەری هەمو ئیسم و خەلکەی لە ( موسل ) ەوە چاوەری‌ی پەتی دوژمنە . وە زیاتر پشت ئەستور بژین بە خەبات ، بەلام تکام ئەوەیە دلخوشی مالەوەمان بدەنەوە ، بە کاغەز بیت بە هوی شەخسەوە دیت ،

هەرچەندە خومان زیاتر ورەیان بەرز دەکەینەوە لە مـوسـل زیاتر هانیان دەدەین و زیاترتی یان دەگەیەنین کە دوژمن بەندی زور گرانە وەك گورانی نەمر دەلیت :

ئەی دەهاك زیندانت قەلا قەلا یە
دیوارت کونکریت دەرگات پولا یە
ئەی دەهاك کوت برە سەختە زیندانت ... تاد

وە بە هیچ جوری ئیمەتان لە یاد نەچیت ، سلاو بـو هەمو پیشمەرگەیەکی کورد ، سلاو بو هەمو چەوساوەیەکی کـورد

ئیتر بو پیشەوە بو بەجی هینانی ئاوانەکانمان لە ژیر ئالای کـومەلەدا

هاوریتان : دکتور ریباز
ژووری سیـدارە
١٩٨٠/٦/٢٩

شەهید : دکتور ڕێباز

روونکردنەوەیەک

ئەم نووسینەش ئەگەر بە کەڵک دێت " ڕوونکردنەوەیەکی چونیەتی دوربینین لە ناو خەڵکدا •

" خەباتی گەلان دەبێتە هۆی ڕوخاندنی کۆڵەکەی ئیمپریالیزم و بێ هێزکردنی ئەو هێزە دڕندانەیەی کە دەسەڵاتی سەر جیهان " •

پەرەسەندنی ئەوەستاوی خەڵک دەبێتە هۆی لە ناو چونی کاری گۆڕانی تەواوی ژیان وە لە گەڵیا دەوری بیرە مادیەکانی زیاتر بەرەو دەسەڵات بەم گۆڕانە و دەبێتە هۆی لەناو چونی ئاژاوەی بیر و وە ڕەنگ بونی خەماوەر بەو بیرانە و وەستوونی ژیانی ئەوان و چارەسەر کردنی پێویستی یەکانیان و نەبونی هێزی ڕێکخەری ژیان و پاك نەکردنی ئەو هۆیە سەرەکیانەی کە دەبیتە هۆی بەرەڵڵایی و خەساوی کۆمەڵایەتی خەڵك دادەبڕێت لەو پێشکەوتنە • پەیدابونی ڕاستەقینەکانی نێو ئەو ژیانە و دۆزینەوەی دەردی تەواوی نەخۆشی یەکانی کۆمەڵ و جێ بەجێ کردنی پێویستی یەکانی ئەو خەڵکە زیاتر بیری مادی دەچەسپێ و دەبیتەهۆی سەلماندنی بیرە زانستی یەکان و گەڕانەوەی ئەو خەڵکە و باوەڕ هێنان بە ژیان کە دەگۆڕێ لە واقیعی پیسەوە بۆ واقیعی ڕوون ، کرده‌وه‌کانی ئەم فاشی یانە بە هاندانی خەڵك و بڵاوکردنەوەی بیری چەپەڵیان و قایم کردنی بە هۆی پارە و ئەو ئابوری یەی کە

هەیانە رۆژ لە دوای رۆژ بێ هێز دەبێ و دەردەکەوێ کە دور لە واقیع و راستەقینەیە ، بەردەوام لە ناوبردنی هەژار و رەش و روتی ئەم گەلە و شاردنەوەی ئەو هەمو زیندانیە لە ژێر زەمین و شوێنە نهێنی یەکان دەردەکەوێ و رون دەبێتەوە کە دڕندەیی تەنها ئاشکرا نییە بەڵکو شێوەی زۆر هەیە و هەمە دەمە بار و تایبەتیتی خوی هەیە .

کەواتە وەستانی ئەو کۆمەڵە بەهێزەی کە میللەتی پێ بەند کردوە و مەرامی پەیوەسی بێ جێ بە جێ کردوە پێویستی سەرەکی و زۆر پێویستە کە لە شوێنە رەنگەکانی ئەو رژێمە بەد ڕی و بەرهەمی کەم بکرێتەوە .گۆڕانی ئەو کۆلە بەندە بەو ئیش و کارەوە کە ریکخستنی ناو خەڵك دەیداتەوە دەوری ئەو ریکخراوانەی کە هەڵدەستن بە خزمەتی ئەماوەر زور بەرجەم چونکە تەنها وتار خویندنەوە و شی کردنەوەی چونیەتی شورش و دەوری پێشمەرگەکان و بلاوبونەوەیان و لیدانیان بەرامبەر بە دوژمن نابێتە هاندانی تەواوی خەڵك بو هاتنە ریزی شورشەوە بەڵکو بەشدار بون لە خوشی یەکانیان و نا خوشی یەکانیان ، چارە سەر کردنی ئەو ژیانە دوا کەوتوەی کە هەیەتی و ساڵە هەسای ساڵە نەی زانیوە چون رەزەکەی یان توتنەکەی بەرهەم بێنی بەردەوام بەشدار بون لەو مەلس و کەوتانەی کە هەیانە و بەجێ هێنانی پێویستی یەکانیان و پاشان بلاوکردنەوەی بە کـــردەوە .

ئەو کارانەی کە لە خزمەتی ئەوان دایە دەبێتە مایەی بەختەوەریان و رەنگ دانەوەی لە نێوان و بەکار هێنانــــی

وەك جیبەجی‌کردنی ویژەکانیان کە چەند مەها سالە لەگـــەل ژیانی ئابوری‌یان داهاتوە ، هەروەها زانین و دوزینەوەی دەرمانی تەواوی نەخوشی یەکان و زانینی چونیەتی زمانیـــان بی‌ی ئەو ژیانە سەختەی هەیانە دەبیتە هوی گورانی ئـــە و بارە نا لەبارە بو باریکی لە بار و چاك و بلاوکردنەوەی‌خویندن بە بی‌ی ئەو کارانەی‌کە لە. خزمەتی ئەوان دان و نەهیشتنـــی ئەو کادیرانەی کە تەنها کاریان دوزینەوەی شوینی لە بـــار و دیهاتی چاکە بو حەسانەوەی خویان و هەلسورانی مەرامـــی تایبەتی خویان و بەشدارکردنی کاریگەرانەی ئافرەتان بـــو بەیداکردنی متمانەی تەواوی خەلك کە گەل پیویستی بەهەردو کیانە بە ژن و پیاوەوە .ئەو کاتە سوزی خەلك دەگوری بـــو شورش و هاتنە پیشەوەی تەواوی خەلك بو ریزی شورش بـــە شیوەیەکی مەبدەئی و راستکردنەوەی ژیانی نالەباری خویان . ئەو کاتە ئەو رژیمە دەکشیتەوە دەورو بەر و دیکە چـــــول دەبی و کەسی بە دەستەوە نامینی و بەرهەمی کەم دەبیتـــە وە هەروەها دزی و جەردەیی بە تەواوی بال دەکیشی بە سەر دائیرە و مەرکەزە ئابوری یەکان و بی کاری بەرە دەسیـــنی و ئەو ریکخستنە پر دەبیتەوە بە رابەری تەواوی چەوساوە و رەش و روتی ئەو گەلە و سەربەخو پاك دەبیتەوە ، ریزەکانیش لـــە ئینسانە بودەلەکان و دزەکان و خاوەن مەسلەحەتەکان پـــاك دەبیـــتەوە .

هەرکاتی چەوسانەوەی بە هیز و زور و ستەمی جەلـــادە کان بەرەی سەند دەری دەخات‌کە خەباتی چینایەتـــی شوینی خوی بە تەواوی گرتوە و نوینەری راســـتەقیـــنەی خـــوی

دوزیوەتەوە ، پەرەسەندنی خەباتی خەلك و تیژبونی داپلوسین و كەمی شتومەك لە بازاردا ، هەمو ئەو شتانە دەبیتە هـــــوی یەكخستنی هیزی راستەقینەی گەل و جوشدانی هیزی چەپ و پەیدابونی مانگرتنی گشتی •

هەر ئەوەندە توانام هەبو بنوسم ، ئیتر ئیوەی بـەریـــز باشتر دەتوانن ریكی بخەن و زیاتر گەشەی پی بدەن •

هاوریتان
ریــبـــاز
٣٠/٦/ ١٩٨٠ مـــوسل

## نامەی ژمارە ٤٩

شەهید : دکتور ریباز

دارێ ئازادی بەخوێن ئاوندری قەت بەرناگرێ
سەربەخوێی بێ فیداکاری ئەبەد سەرناگری

... مانەوە لە ریزی براکانمان ، خەبات لە نێو توێژەکان ، بەرێ کردنی فرمانەکانی چەوساوەکان ، شکاندنی توند و تیژی زوردارەکان ، نە هێشتنی کوت و زنجیری نەتەوەکان ، پەیدا کردنی هەموو گەلە چەوساوەکان ، تەقینەوەی ناکوکی یەکان زیاتر و هەنگاو بە هەنگاو نزیکمان دەکاتەوە لە ئاسوی سەرکەوتن .

برای بەریز کاك

برای بەریز کاك (( . . . . . ))

بەریز کاك(( . . . . . ))

هەمو برایانی تیکوشەر

هەمو پیشمەرگە قارمانەکان

لە ئاسوی سەرکەوتنەوە دەروین ، لەبەرە بەیانی گەشی چەوساوەکانەوە دەست پید ەکەین ، ئای ئازادی گەلان ، ئای گورانی خوبەخوی کومەل ، ئای پیشخستن بە پیی بیرە مادیەکان ، ئای گورینی هەموو ژیانی خەلك لە نالەباری بو لەباری ، ئای لەو هەتاوە گەشەی کە خەلك لە دەستی دەگرن لەسەر لوتکەی چیا گەردن کەشەکانی کوردستانەوە ولە دەنگی پر لە تینی بی شوینەکانەوە ، لە ئیش و ئازاری هەموو بی

کاروانی جیهانەوە ، لەوتریدانە بە هێزەی کە لە هەو خەباتی گەلانی جیهانەوە دروست کراوە و دۆل و ئاو و چیا و باخ و دار و دەوەنی کوردستانی کردووە بە قەڵای ڕزگاربونی هەمو گەلە چەوساوەکانی ناوچەکە و یەك لە دوای یەك کۆڵەکە ڕزیوەکانی ئیمپریالیزمی پێ دەروخێنێ ٠

ئەی دەنگی دلێری هەمو دەرکراوەکان ، بو یەك ناگری بە حاری چینی نوی یان پێ سازیژ کری ٠ ئەو لیکدانە بەسە هێزەی روز بە روز گەلی کوردستان دەیبینی بە خوینەوە هەموی دەرخەری بیگەیشتنی چەوساوەی کورد ٠ و رزگاربونی گەلە لە پەیدابونی نوینەری چینە دەسەلاتدارەکان و یا نەکشەبسان و دەرخستنەوە لە کوری خەبات نیشاندەری تا موی سەرکەوتنە ٠

دەنگی دلیری ئیوە چیاو دولی کوردستانی پر کردوە ، هەمو چەوسارەکان سەریان بەرز کردوتەوە و بە تانازسەوە ئەیانەوی دەوری پیشرەوی بگیرن و ڕێبەی زورداری بە جاری هەلکەنن ٠

بەریزان :

ئاواتی من بەرد هوام بونە لەسەر ئەو ڕیرەوە پیروزەی مارکسیزم لینینیزم کە تاکە ڕیبازی بەدیهینانی سەرکەوتنە ٠

---

حەزدەکەم هەندیك وردە تیبینی بخەمە پیش چاوتسان کە پیوەندی بە سیاسەتی ئەمروی فاشستەکانەوە هەیە ٠ روژ لە دوای روژ رژیم سیاسەتی نوی و هەلی نوی دەدوزیتەوە بەلکو بتوانی پتر لە سەر حوکم بمینی ، بو نمونە دریژە بە شەر دەدا

لەگەڵ ئێراندا و دیزەدان بە ناردنە دەرەوەی خەڵکی دەو ـ
لەمەند بوناو ریزەکانی شۆڕش و خۆ خەریك کردن بە شارەکانی
کوردستانەوە و زیاتر قەبەکردنی شۆڕش و بێ گوێدانە چونیەتی
خەڵك زیانمان پێ دەگەیەنێ تکایە شۆڕشەکە بە دەوڵەمەندەکانی
کوردستان قەبە مەکەن بەڵکو چونیەتی ببێتە چاکبوونی ئیسە و
کە ئێمەتە ، هەروەها گۆڕینی ئازاردان لە هەمیشەی کەرکسوك ،
باشان گوێزانەوە لە هەمیشەوە بۆ نەمن و ئیستیخباراتی شارەکان
چونکە هەمیشە ئازاردان و ایدانەکەی لە جاو شوێنەکانی تری
شارەکان کە مترە هەروەها دەرکردنی لێبوردنی زو زو بسەر
گەرانەوەی خەڵك و دەرخستنی تەنیا مانەوەیەتی و دەروستکردن
ئاگوکو نیوان هێزەکانی کوردستان · حکومەت خەڵك بەکری
دەگری بۆ لەناو بردنی ئامر هەرێم و لێپرسراوە گەورەکان · زور
پێویستە ئاگادار بن و تکاتان لێدەکەم بە یەك ر دوان نەچنە
هیچ شوێنێك ·

بەڕێزان :

ئاواتی من زورە و بەر بەری بەختەوەریتەرە خەوادارم ببینمە
دی · ریکخستن هەموان دەگریتەوە و هەموان چاك دەکا
ریکخستنی پۆلایین ، خێرا خێرا فێربون ، تەرجەمە کردنی
هەمو پەرتوکەکان ، لێدوان و گفتوگو کردن ، تەواوی ئەمە و
ئەمانە مەسەلەی زور گرنگن · تکایە لە کاتی تەقاندنی گوللەی
ئاربی جی نوسراوەکانتان بیر نەچی ، زیاتر گەشە بە خۆتان
بدەن ، با پێشمەرگە تەنها چەك هەڵنەگری و نان نەخوا بەڵکو
پێویستە نوسراوەکانیش بخوێنیتەوە · باش بۆیان راڤە بکەن ،
و فێری پێوەندی و گیانی لێپرسینەوەیان بکەن · هەرکات بیمرە

ماده‌یه‌كان له‌ناو كومه‌لگادا گه‌شه بكه‌ن و ببن به‌ خواردنی خه‌لك ، گه‌شه به‌ هونه‌ر بده‌ری و باری گوزه‌رانی خه‌لك سوك ده‌بی . به‌ ئاواته‌وه بوین هه‌مو چه‌می ریزان بكه‌ینه بنكه‌ی سوری پیشمه‌رگه‌ و له‌شكری سوری لیره‌ ده‌رچی . به‌ ئاواته‌وه بوین بنكه‌ی ئه‌مجاره‌مان هیچ شاره‌زا و دنیا دیده‌كان پچه‌وزیته‌وه و هه‌مو سیاو جیهازی ئیلیكترونی جیهان ریان پی ئه‌بردبایه . ژیر زه‌مینی شه‌ریمه‌كمان زور له‌باره بو دابین كردنی هه‌مو پیویستیه‌كانمان بو پیگه‌یاندنی روله هوشیاره‌كانمان . زور به ئاواته‌وه بوین ئاو روژه ببینین كه كومه‌له تیایدا ببیته پارتی پیشره‌وی چه‌وساوه‌كانی كوردستان ، به‌ ئاواته‌وه بوین بتوانین چاره‌سه‌ری هه‌مو كه‌م و كوریه‌كانی ریكخستن بكه‌ین و گه‌شه به‌و په‌یوه‌ندیه‌ی نیوان قاعیده و سه‌ركردایه‌تی بده‌ین . ئیمه پیویستمان به له‌به‌ركردنی وشان و برنگی پرنسیپه‌كانی ماركسیزم نیه ، پیویستمان به وه‌رگرتنی راستیه‌كانه ، تكام وایه له‌سه‌رچاوه ته‌سلیه‌كانی ماركسیزم-لینینیزم شت فیربن ، هه‌ر پیشمه‌رگه‌یه‌ك پیویستی به تیگه‌یاندن هه‌یه ئینجا ئه‌توانی چه‌ك بكاته شان و له دیهاته‌كاندا جموله بكا . به‌راستی هه‌موكات ده‌مویست پرینسیپه گشتیه‌كان له‌گه‌ل واقعی راسته‌قینه‌ی كوردستان بگونجینم . ئیمه هه‌رمان پیویستمان به خوفیركردن هه‌یه ، پیویستمان به تیگه‌یشتنی واتاكانی ماركسیزم لینینیزم هه‌یه .

---

هه‌مو ئه‌و هه‌والانه‌ی پیمان گه‌یشتون پتر هانمان ده‌ده‌ن له‌به‌رده‌م سیداره‌ی فاشیسته‌كاندا به‌بی ترس و سله‌مینه‌وه خوراگر بین و وره به‌رزمه‌ند بین و به هیزی بیر و باوه‌ره‌كمانه‌وه

جاریان لەبیر کەین و بچینە ریزی کاروانی هاوڕێ شەهیدەکانمان
خاڵە شەهابی نەمر و ماموستا جەعفەری تێکۆشەر و هاوڕێ
ئەنوەری نەمر و ماموستا عەزیز و نەبەزی نەمر و دەکتور بارفسی
قارەمان مەلا عەلی و ئاوات و ئەلوەند و هەموو شەهیدانی
ئەم ڕێگا پیرۆزە ، ئینجا ماموستای نەمر کاک ئارامی شەهید و
کاک شەمال و شامل و شەهیدی نەمر کاک سیروان و حاجی
چاوشین و حەسەن خاوی و هەموو ئەو شەهیدە نەمرانەی گیانی
پیرۆزی خۆیان بە کوردستان سپارد و چوونە ریزی کاروانی
شەهیدانەوە .

ماموستا نەبەز دەفەرموێ :

شەهید بین و کاروانمان لە ڕەوتدایە
سەربەرزین و مەشخەڵمان لە گەردایە

ڕۆژ بە ڕۆژ ورەمان بەرزتر دەبێ و بەو پەڕی شانازییەوە بەرەو
کاروانی شەهیدانی کوردستان دەڕۆین . هاوڕێ یانی ڕۆژی
سێدارە زۆرن . ئەو هاوڕێیانەی پێشمەرگە بوون و جاشان و
عەسکەر گرتونی :

١ ــ هەژار ، ٢ ــ مەلا زەوقی ، ٣ ــ ساماڵ ، ٤ ــ چەتۆ ،
٥ ــ عومەر ، ٦ ــ حەلال ، ٧ ــ پیرۆت ئیبراهیم ،
٨ ــ ئیبراهیم ڕەسول ، ٩ ــ محمد ، ١٠ ــ لەتیف
عەبدوڵلا .

ئەم هاوڕێیانە پێشمەرگەی یەکیتی نیشتمانی کوردستانن و
بەراستی لە هەیئە هیچ ئیعترافیکیان نەکردوە و قارەمانانە
بەرامبەر بەو ئەشکەنجە و توقاندنە وەستان . هەروەها ٩ کەسی
تر کە بزوتنەوەن لیرەن و ژمارەیەك لە پۆلیس و عەسکەر و مەدەنی

که خویان تەسلیم کرد وتەوە لیرەن ٠

حەزدەکەم حونیەتی شەرەکەی،کانی سورتان،بو بگیرمە و ە
کە بەسەر ئیمە هات و بوچی وامان بەسەر هات ٠ ئیـــــــوارە
چوینە کانی سور ، بە نیازی ئەوەی بەیانیان عەسکەری دیتـــە
ئەوی و لیی دەبین ، شەو (( ٠٠٠٠٠ )) بریاری دا سەعات
٦،٣٠ کەمین دەرچین ٠ بەیانی سەعات ٦،٣٠ هەستـا
خومان پیچایەوە عەسکەری هاتە ناو دێ یەکە ، ئیمە ٩ کە س
بەلای (( بوگد )) دا ئەوانی تر بەلای کلیسەدا ، کە روما ن
کردە بوگد جەیش گرتبوی ، ئیمەش لە دوکان نزیك بوینـــەوە ،
٦ کەسمان جیابونەوە و بەرەو بوگد رویشتن ئیمەش بەرەو کلیسـە
گەراینەوە من و حەلال لە دەوری ئاوەکە لەسەروی بوگـــد ەوە
ماوەیەك ماینەوە چەکەکە نمان لەبەری ئاوەکە داناو پەریـنەوە ،
لەگەل ئەوەشدا تەقەیەکی یەکجار زورمان لەسەر بو ، پەرینــەوە
بەری چەمەکە و چوینە ناو کونیکەوە لەوی ماینەوە ، هەلیکوپتـەر
تەقەیەکی زوری لیکرد ین وبەر نەکەوتین ، تا سەعات ( ١١ )ی
پیش نیوەرو لە هە مو لا یەکەوە عەسکەری هات و ئیمەش هەر لــە
کونەکە دا بوین و هاتنە سەرمان ، هاتنە ناو کونەکەوە ٠ هیچ
هاوارمان نەکرد بەلام پیش ئەوە کەشف بوبوین کە لەو کونـــە
داین و هاتنە دەوری کونەکە و هاواریان لیکرد ین ئەگەر دەرنە
چین بە ( رمانە ) هەلید ەگیرینەوە ، ئیمەش هاوارمان کـــرد
چەکمان پی نیە ٠ ملازمەکە وتی مەیان کوژن ئیمەش هاتینـــە
دەرەوە و لەوی یەکسەر دەستیان بەستین و برد یانین بو کویە ،
لەوی دوای دوو سەعات وتیان بچن سەیری ئەوانەش بکـــەن
کە لیتان کوژراون ، کە چوین بینیمان شەش کەسمان لی شەهید

بوه ، ئیمه وامان دەزانی تەنها خومان گیراوین ، بەو جسوره دو روژ لە کویە مایندوه پاشان راپیچیان کردین بو کەرکــوك و شەشمانگ لە هەیئە ماینەوە ئینجا راپیچیان کردین بو موسل هەمرو ئەو رود اوانه ماوەیەکی زوری خایاند تکایە لیمان ببورن ئەگەر نامەکە کەم و کوری تیا بی ، هەمو هاوری یان سلاویان هەیە بوتان ، ئیتر دەبیت یادمان بکەنەوە و تولەمان بسیئن . بەراستی لەبەر نەبونی ماوە ناتوانین نامەکان بەباشی بنوسین بویە دەبی ببورن .

بەریزان :

بە پیویستی دەزانم چەند کەم و کوریەکی حکومەت لـــــه زیندان و د رندیتی لە هەیئە ورد ورد بوتان رون بکەمەوە . لەو روژەوەی کە دەکەویتە دەست ئەم جەللادانە دەتخەنـــــــه کونەوە ، نازانی چونە و چی تیایە . لە هەیئەدا ئەم رەفتارانە پەیرەو دەکەن :

دەست دەکەن بە فریدانی پشتین و گورەوی و هەرچیــه ك وەك جگەرە و شانەو موکیش و تاقمی تەراش و هیچت پی نیـــا هیلنەوە لەگەل ئەمانە بە لیدان بە شەق بە سوندە بە چونـــه سەر پشت و مل و پاشان دەتکەن بەو کونە بوگەنەدا بە شەق و زللە ، وەختیك دەچیتە ژورەوە سەیر ئەکەی کومەلی خەلـــکی ریش داری زەعیف و رەنگ زەرد و بی تاقەت خویان پیچاوە ـــ تەوە و سەریان ناوەتە زەوی یەکەوە ، کاتی دەرگاکە دەکەنـــەوە جوندی دیار دەبیت وە پاشان دەچیتە ژورەوە و دەرگا پولاینە کەت لی دادەخری و دادەنیشیت لەگەل بەندیەکان ، بە هیچ

جوری قسەکرد ن وەیا ن تەما شاکرد نی یەکتر هەلوا سینە ولید ائە ئەبی بوخوت مل شورکەیتەوە و د انیشیت بی د ەنگ ، سەیر ی وەرزی ئەو زورە ئەکەیت وەك گەوری حەیوانیش نییە بەلکو زور زور لەوەش پیس ترە ، بوگەن ترە ، هە مو سەر و ریش د ریژو چلکن بونی پیسیان لی دیت ، هەروەها ئەسپی وەك خوّل وایە لە و بەتانیە بوگەنانەدا ، وە بونی میز لە بەتانیەکان میشك کسا س د ەکات ٠٠ بە هیچ جوری ژیان بو ئینسان نییە لەو شوینەدا ، ئەگەر حەیوانی تیا بیت ئیدارە ناکات ، بە زستان پانسکە و ساحیبە لەسەرت ئیش د ەکات هەتا بە هیچ جرری گەرم نەبیتەوە بە هاوین هیچیان ئیش ناکەن تا بسوتی ی لە گەرمــــــادا و هەروەها د ەرەوە بو ئاو رشتن مە منوعە ، ئاو لە سەتلی مسـیز وەرد ەدری د ەلی با بونەکەی بە سەرتا بیت ، پاشان نــان خواردنەکەی روژی (٢) سە مون و پاشان (٣) ژەمەکــە قزعە دیت بەلام قزعەیەك هەریەکی تیکەیەك و بەس ، لەوە زیاتر نییە ، ئیتر خواردن نییە ، ئیتر خواردن نییە بە هیچ جوری بەباشی توشی هە مو جورە نەخوشی یەك د ەبیت .

پاشان بەریزان تەعزیب لەولاوە بوەستی ، تەعزیبەکان :

١ ــ لیدانی زور لە ژیر پی بە سوندە و کیبل .

٢ ــ کارەبا یەکی بە هیز لە هە مو گیانت .

٣ ــ هەلواسین بە هە مو جورەکانیەوە :

ا ــ بە د ەست

ب ــ بە قول لە پشتەوە

ج ــ سەرەو خوار

د ــ هەلواسین بە یەك د ەست و لەگەلیا جوتیەك و پتلی غاز هەلد ەواسن .

٤ ـ ئاوی گەرم و سارد بە لەشتا •
٥ ـ خستنە ژووری سارد بە زستان و ژووری گەرم بە هاوین •
٦ ـ بێ خواردن کردن و نەدانی ئاو بۆ ماوەی چەند رۆژێ و لە گەلیا لیدان •
٧ ـ رشتنی نەوت بەسەر ئەرزەکەدا و دەتخەنە ناوی و پاشان ئاگری تێبەردەدەن •
٨ ـ بە قسەی خۆش ، وە بە عزێ جار تێزاب بۆ گۆشت بێجگە لەوەی لە هەمو ئیفادەکانت چاو دەبەستنەوە بە توند و بەهێز •
٩ ـ هەلواسین بۆ ماوەی ( ٢٤ ) سەعات •

بەڕێزان :

لەگەل ئەم هەمو لیدان و تەعزیبەدا زۆرەکان کراون بەسە ـ ـرود ی نیشتمانی و ناو نوسینی ئەم شەهیدانی قارەمان و ئەو شەهیدانەی لەوێ بون ، ناوی شەهیدان و شیعـــــری رەتەنی و هاندان بەوەی ئەم درندانە بە هیچ جوری توانای لە ناوبردنی ئیمەیان نییە ، زیاتر سورت دەکات کە خەبات کـــــەیت •

بەڕێزان :

بەراستی ئەو هاوڕێ یانەی لە هەیئە بون بە هیچ جـــوری ئیعتیرافیان نەکردوە ، زوربەیان وەك قارەمان خۆیان دەگرن بە تایبەتی کیژە کوردی قارەمان (( ٠ ٠ ٠ ٠ ٠ ٠ )) ئەو کـــیژە قارەمانە پیش ئەوەی بگاتە هەیئە لە مدیریەی ئەمنی کـــەرکوك هەر بە لیدانی زورو ( تەعەدا ) بە هیچ جوری هیچی لــە

دەم نەهاتوتە دەرەوە ، پاشان کە گەیشتە هەیئە زیاتر خوی راگرت و پاش چەند جاری هەلواسین و لیدان و تەعدا لی ی بە هیچ جوری ئیعتیرافی نەکرد ، چەند کەسیك لەگەلیــــدا گیرا بوو ، براکەی و خزمانی ، هەمو قەزیەی ئەوانیشی خستــە سەر خوی و وتی ئەوان ئاگایان لە هیچ نییە ، تەنها شت کە گیرا بیت لای " الشرارە " ی لاگیرا بو و ئیفادەی دا کە برایەکی بجوکی دوزیوەتیەوە و ئەویش نەیزانیوە چییە و حسنویەتیە نــا و کتیبەکانیەوە و نەیزانیوە ئوا بە بید رینی ، بەو جورە مایــــەوە و هیچی نەوت ، بەراستی ئافرەتیکی ئازاوخوگری ئەم سەردەمەی کورد ە . پاشان بەر هەمو محاولەی بوی کرا بو حوکمیان دا و پاشان وابزانم بەرەلایان کرد ......

بەراستی کچە کوردەی شیارە خوینا ویەکەی کەرکوك (( ...... ))
[illegible]

ئیجا بەریزان بچینە سەر هەیئە و پاش تەواوبونی تەعزیب [illegible] ... وەك حەیــوان [illegible] (٢) [illegible] لە قەفەزیکی [illegible] دەتلەن بە زورا ، یەك بە یەك ناوەکان دەخوینیتەوە و دەچیتە لای ئەم حاکمانە ، دەلیت قسە بکە و ئەو ئیفادەیەی لـــــــە مەحکەمە داوتە راستە یان غەلەتە ، ئەگەر بلی ی راستە ئیتــر حوکمت دەدا .. وە ئەگەر بلی ی وانییە سەر لەنوی بو تەعزیب لەوی جونیەتی مەحکەمە بەم جورەی خوارەوە یە :

یەك بە یەك ئیفادەت لی وەردەگرن ، چەند قسەیەك بــە گالتە کردن بیت و پیکەنین بیت ، پاش تەواو بونی هەمــوی

دەتکاتەوە زۆرەوە ، قەرارەکەت بۆ دەخوێنمەوە بەم جـــــۆرە :

(( حکمت المحکمه الخاصه فی التامیم بالتاریخ الفلانـــی و بموجب الماده الفلانیه بقرار مجلس قیاده الثوره و باسم الشعب )) حوکمت دەدا بە ئیعدام :

بەڕێزان ئەکەس ئاگای لێمانە ، نەکەس دەزانێ لە کوێین ، چەند جەلادێك بە بڕیاری گەل [illegible] دە مانخنکێنن ، نازانن گەل [illegible] دەزانێ بەبێ چەندن پاشان لە [illegible] دەکەن بۆ [illegible] تەکەی مووسڵ [illegible] باشماوەیەك تەنفیزت [illegible] ، دەتکەن بە پەتا بە بەرچاوی هەموانەوە وە یان ئەوانــــــەی زیندوون ، بەڕێزان لە زۆری ئیعدام پیسترین معامەلە مسـان دەکەن و ئازاری زۆرمان ئەدەن بەڵام ئێمە چاویان کوێر دەکەین وە دەنگمان تێکەڵاوی هەمو شەهیدانی ڕێگای رزگاری گــــەل دەکەین و بە سروود و هاوار کردن دەچینە ژوورەوە و بــــــــە دەرخستنی هەموکەم و کوری یەکانیان دەچینە ژوورەوە و بـــە هیچ جۆری کۆڵ نادەین لە خەبات .

بەڕێزان ، تکامان بە جیهێنانی خزمەت بە گەلە و بـــــە چەوساوەی کوردە ، وە ڕێکخستنی هەمو هاوڕێیانە لە شار و لە دەرەوە لەسەر ئەساسی وتنەوە و فێربوونی بیروباوەڕەکـــــانی مارکسیزم لینینیزم و بیرکردنەوە لەو واقیعە و چاندنی بـــــــە شێوەیەکی عیلمیانە لە کوردستان و لە عیراق دا ، بەڕێزان بە ڕاستی بە شێوەی معامەلە و ئوسلوبەکانیان و قسەکانیان هەمو کاربەدەستانی سلطە باش ترساون ، چونکە بەڕاستی زۆربــەی هاوڕێیان کە بران بۆ تەعزیب لەو هاوڕێ یانەیان پرسیوە : باشە ، کە شا لە ئێران دەرچو ئەو دەست و دائیرەیەی کە

مانەوە لە پاش‌شا چیان بێ کردن ؟ ئەو هاوری بە وتبوی وەللا هەمویان چاویان هەڵئەکۆڵین و گەڵ بەر دا ریان ئەدان ٠٠ و هەروەها لەناو خویانا قسەیان کرد بو ، وتبویان ، لە لایەك حوکمی زاتی و لە لایەك ئیران و لەلایەك شیعە و لە لایەك سوریە و لەلایەك لیبدان و تەعزیب بە راستی ئەمانە هەموی نیشانەی نەمانی بیر و باوەڕیانە بە حزب و بە خویان و هەموی دەرخەری لە باو چونیانە ٠٠ لەو رۆژەی هاتوینە خەنگە هەمو هەلس و کەوتەکانیان نیشاندەری لە ناوچونیانە ، بەڕاستی ئەم درندانە زیندانەکانیان سەختن ٠

گورانی ئەمر دەلی :

ئەژدەهاك زیندانت قەلا قسەلایە
ئەژدەهاك کون بوە سەختە زیندانت

بەراستی هەمو جولانەوە و هەلس و کەوتیان درندانەیە ٠٠ ٠ هەمو ئوسلوبیکیان فاشیانەیە ٠

لە کوتایی نامەکەدا سلاو و ریزمان بو هەمو هاوری یان وهەمو پیشمەرگە قارەمانەکان ٠

هاوریی دلسوزتان
دکتور ریباز
زوری سیدارەی موسل ١٤ / ٧ / ١٩٨٠

## نامەی ژمارە ٣٠

شەهید : دکتور ڕیبازر

ژوری سیدارە
١٩٨٠/٧/٢٩

* هەمو هاوڕێیەکی دلسوزی کومەلە . هەمو هاوڕێیەکی دلسوزی گەلی چەوساوە بە هیچ جورێك کول نادا؟ لە خەبات ، ناتاجی بیرو زابەتی گەلە و رزگاری چینە چەوساوەکەی گەلە . ئاواتمان بو زیاتر سەنگەری شەرەفمان بگرتایە و زیاتر خەباتمان بکردایە . زیاتر لە واقیعی دواکەوتوی میللەتمان بدیبایە بە ریکخستنی تەواوی چینە چەوساوەکان زیاتر گلپەی ئاگرەکە مان خوش کردایە

بەرێزان
هاوڕێ بانی خوشەویستی گڕپەی شورشگێری ' ئاگری '
تەبەز :
سلاوێکی شورشگێرانە .
ئەی هاوڕێ بانی دلسوزی گەل .
ئەی بەخشندەی وەرەی بەورتر بە گەل .
ئەی تێکوشەرانی راسەمینەی نیو جەرگی دوژمن ، ئیو گلپەی ئاگری بە تین ، شانازی بە ئیوە و ئەو هاوڕێ یانە کەوا بە تەنگ ڕونەکانیانەوە دین . جێی سەربەرزی و زیاتر سورتر بونە لە خەبات ، زیاتر هاندانە بەرامبەر دوژمنە فاشیەکەی بە تەندا زیاتر پی داگرتنە لە مافی رەوای گەل ، زیاتر وورە قایم تر دەبێ

زیاتر ناوی نوی له دایك دهبیّ ، زیاتر پالّ دهدهین بهیهکهوه تا دوژمنهکهمان به تهواوی توره کهین تا ههموو تیرهکانی بها ـ ریژیّ تا خالّی دهکاتهوه وه دهکهویته پهله قاژهی مردن .

بهریزان :

خهباتی بوّ وچانی گهلهکمان و ههموو گهلانی جیهان پهیوهندی به تینی ههیه به گورانی تهواوی ئهو باره ئالوزهی که سهرتاپای ولاتی گرتوتهوه ، دهرکهوتنی ورهی جهماوهر و وریابونهوهیسان به هوّی ئهو ریکخستنه بههیزهی بریرهی شورشه و لهناوبسه ری چینه خوّرهکان و پیاوه دهولهمهند هکانی نیو گهله ، بسهریزان به دادکاریتان به لیپرسینهوه لیّ یان ،روژ به روژ خوینسی تازهی خهبات پشت ئهستوریان ئهکات بهرهو کاروانی ئـــه و شههیده نهمرانهی که لهم ریگا پیروزه و له قهسابخانهکهی موسل گیانی پاکیان بهخشی بهو گهله چهوساوهیهی ههر له کونـــهوه بی بهشه له تروسکهی ئازادی ، خومان به بهختهوهر دهزانیـن فریای ئهو کاروانه بکهوین ماموستا عهزیز و نهبهز و دکتور مارف و مهلا عهلی و شـــههیدانی ههریمهکانی تر ، پاشان بگهیـنه کاروانی خهباتی خاله شههاب و ماموستا جهعفهر و ئـــهنوهر زورابی نهمر و ههموو ئهو هاوری یانهی گیانی پاکیان بهخشی به گهلی چهوساوه ، کهواته به هیچ جوری وه بهبیّ پهریشانی بهو پهری شانازی بهوه داوا له شههیدان دهکهین له گـــوری شههیدانا جیگهیهك بو ئیمه دیاری بکهن و به کوری گهلمـــان قبول بکهن ، بهراستی گهورهترین شههادهیه که گهلهکمـــان پیمان دهبهخشی چونکه داری ئازادی خوینی دهوی ئـــهگهر من نهیکهم و تو نهیکهی ئهی کی خوینی خوی بریژی کهواته ئه و

شەرەنەی میللەتی کورد بە ئیمەی دەبەخشی مایەی شانـازی و سەربەرزی و کامەرانی ئیمەیە .

ئیتر با گەشاوە بێ ئالای شۆرشی تیکوشان

با بژی گەلانی چەوساوەی جیهان
بژی کومەلەی رەنجدەرانی کوردستان
بژی خەبات ... بژی تیکوشان

هاوریتان
دکتور ریبـــــاز
۲۹ / ۷ / ۱۹۸۰ ژوری سیدارە

نامەی ژمارە ١٧

شەهید : دکتور ڕیباز

بەڕێز ......

بەڕێزان ......

دایکی پیرۆزو دایکی دڵسۆز ، ئەو دایکەی دڵی داتوتە جوش بیکا بەگر بو ئەو لاوانەی ژین لێ یان دەبیتە ئەرك و ئازاریان ، ئەو دایکەی هەروەك هەمو تێکسەندەری پیگای زوردارەکان لاوەکانی گوش دەکات و فیریان دەکات کە ئامانج و ئاواتی گەورەی لە سەرە پەیوستە پەدی بهێنی ، هەمو سەردەمێکی ژیانی ئەجولێنی و دەردی بێ دەرمانی ئەمروی بەهاری بێ گولمان پێ چارە دەکات .

سەرەتای ئەو ژیانە سەختەی کە لە ئیمەوە دەست پێدەکات زور ئالوزە و بەسەر یەکدا چراوە وە جیاواز کردنەوەی ئەم لەو ئەو لەم و وچانی دەویت وە دەوامی دەوێ بیکەین لە سەری ، هەموان و هەمو لاوێك کە دیتە ئەم جیهانە بیگومان خاوەنی دایك و باوك و برا و خوشکە ، وە هەر یەکێك لە ئیمە خاوەنی سۆزە بارامبەریان وە پەویستە قەرزی پیویستی یان حق بە جێ کەین و ئەو ئاوات و ئامانجەی کە هەیانە لەو ڕوژەی منالەکانیان پەروەردە دەکەن پەویستە بهێنرینە دی و ئەو خێر و خوشیە کە نەی بوە وە سودی لەو ژیانە وەرنەگرتوە کە خزمەتی ئێمەی پێکردوە ، پەویستە بە هەمو توانامانەوە ئەو ئەرکەی کە سەرفی کردوە بوی بدەینەوە ، وە پەویستی یەکانی ژیانی بە شیوەیەکی نوێ ڕێکخەین وە ئەو دەورانەی کە نەی ئەتوانی چارەی کات

ئیمە بۆی چارەبکەین رە ژیانێکی گونجا و لە باری بۆ ئامادە کەن
کەواتە دروست کردنی پتەوی و رێکخستنی مال یەکێکە لە هەرە
ئەرکە پیرۆزەکانی سەرشانمان و بە هیچ جورێ نابی پەناگرێتی
خەمین ولێژی سارد بینەوە .

یارمەتی دانی دایك و باوك و برا و خوشك و بە هەمو
لقەکانی خزمانەوە دەبیت لەسەر بنچینەی پەروەردەی ریشك و
ورد بیت وە بەو مانایە تێگەیشتن لەم ژیانە و هەلسەنگاندنی لە
سەر بنچینەی تێگەیشتن لە خەلك و لە پیویستیەکانی .

کەواتە لەسەر ئیمە بو کە بنکەی بچوك لە مالی خومانا بنیات
بنێین . ئینجا لەم مالەوە بگوێزینەوە بو شوینێکی ترکە بتوانین
ئەو رەنگدانەوەی توانیومانە بیکەین لە نیو مال و کەس و کسارا
پیویستە بگوێزرێتەوە بۆ نیو خەلکی تر واتە بو نیو ئەو خەلکە
زۆرەی کە نالەی دەبێ بەدەست دواکەوتنەوە و ئازارەکانی
ئەمرودا . لەو دەردەی کە سالەهای سالە هەمو جیهان
پیوەی دەنالیتی .

بەراستی زور شاد بوم زیاترم بنوسیایە وە زیاتر شتم بو
هەموتان رونکردابەتەوە بەلام لەبەر کەمی ماوە نەمتوانی بو هەمو
تان شتەکان بنوسم وە بەتایبەتی هەمو برا و خوشکان و ئاموزا
و کوری بور ...

لە کوتاییدا سوپاسی هەمو لایەك دەکەم .

کورتان . براتان
ئیبراهیم ١٩٧٩/١١/١٢

شەهید : دکتور ریباز

برای بەریز و شیرینم کاکە ....

سلاویکی پیروز ، سلاویکی نیو دلی پر لە سوز ، سلا وی
گیانی منی دور لە توی بەریز ...

کاکەی بەریز ، لەو هەستەی لە کانگای دلمان ئەتکی ،لەو
هیزەی لە نیومان دروست دەبیت ، لەو ئازارەی لەسەرمان
دەخشی ،لەو رەنگەی کە بەرەو ئاواتمان دەکشی ، دەنیرم بو
تو هەزاران دەستەی گولی سوری نوی رەنگ دراپی بە جلی
بی کەسیك ... برسی بەك ، بە نانی رەش و روتیك ،تیەو-
یەك ، وەك دایکی شەهید یکی زیندو ، وەك بی بەشیك ،داخ
لە دلیك ، وەك گەلیك ،لە دیر زەمانەوە لەناو بیریك ، بسە
پیروزی چیاو دولەکان ، بە رونی ئاوی کانیاوەکان ، بە فینکی
سەیرانگاکان ، بە یادی هەمو ئەو شوینە رەنگینانەی بە گلی
سەر لیوی شەهیدەکان ، بە دەنگی دلیری چەوساوەکان ،
دەلیم و دەیلیمەوە ، من دەتویمەوە بو ئەو گەلەی دەیچەو-
سیننەوە .

ئەو ئاوات و ئامانجەی کە دە میکە ئیمە چاوەریین ، ئەو
بنکە سورەی داوای ئەکەین ، ئەو هیزەی رەچاوی ئەکەین ،ئەو
لەشکرە سورەی دروستی ئەکەین ، دەبیت و دەبیتەوە بە رولەی
بی دەرەتان ، دەبنەوە بە بازوی دەرکراو و زور لیکراوەکان ،
دەکرینەوە کوتی بەندایەتی زورداران ، ...... هەزاری
نیو ولات گرد دەبنەوە . گورانەکان خیرا دەبنەوە ، ئەو هەمو
زورلیکردنە دەبرینەوە . ئاسایشی ژانستی دروست دەبنەوە ،

کومەلی نوێی پێشکەوتنخواز دروست دەبنەوە و بەردی بناغەی
یەکسانی دەبێتەوە ، کومەلی بێ چین دەگەشێتەوە ، ئاوات و
ئارەزووەکان یەك لە دوای یەك بە جێ دەگەن ، کومەلی بێ سوو
ئەرك دروست ئەکەن ..

کاکە گیان :

لەو سەردەمەی پێشکەوتنی جیهان و ئەو گورانە زانستیا-
نەی کە دەبینت بەسەر خەلك و بەرەوری بەرەوپاوەری پێشکەوتن-
خوازی جیهانی و چولکردنی هەمو بنکە نەبیوەکانی ئیمپریالیزم
و گەرانەوەیان بو دواوە و ئەو سەرکەوتنە گەورانەی گەلانی جیهان
بەدی هیناوە بەرامبەر زوردار و دەولەتە ئیمپریالیزمەکـــان و
خەباتی بێ وچانی گەلانی بێ مافی و خەباتی چینایەتی هەمو
گەلانی جیهان دژی سەرمایەدار و زوردار بە جارێك پەرەی
سەندووە ، روژ بە روژ جەرخی بەردەمی ئابیایەش نزیك دەبی
و یاسا زانستیەکان جوری راستەقینەی خویان ئەگرن و بەردی
بناغەی سوشیالیزم و کومونیزم دەچەسپی ، بەلام ون نەبوونی
راستی لە چاوی ئیوە و [illegible] ... جەللە دەبێتە هوی جوانی
ئەو گورانە و ئەو سەرکەوتنانەی کە گەلی عیراقی دەبینی بە ...
خویەوە و بە تایبەتی نەمانی بیرە دواکەوتووەکان و گەشەکردنی
چینە شورشگیرەکان و تیك چوونی لەسەرخوێی پایەی ئابووری
سەرمایەدار و خاوەن پارەکان و پاشان گەندەل بوونی ئەو هیزە
سیاسیەی کە بەستراوە بەو ئابووری یەی خوی دەمحـــکێنی و
تیوری چینایەتی گەشە بو ئەمکاتەو سەردەمی خەبـــاتی
راستەقینەی کریکار و پارەتی دەرەکانی دەرەخسێنی و روژی
نوێ دەهێننە کایەوە بو دروست کردنی هێزی سیاسی ئاودراو

به بیری مادی و رەنگدانەوەی بە نانی ئابوری و گەشەکردنی بە پێی پێویستەکانی کۆمەڵ و دروست بونی گەشەی تەواوی چینا-یەتی و سەروکایەتی چینی شورشگێری کرێکار و بلاوبونــــەوەی بەربەرەکانی ی زورداری و نەهێشتنی بیرە تێکدەرەکان و راست بونەوەی تەواوی بیر بەشەکان بە تەواوی گورانی گەورە بەسەدی دەهێنی و دەبێتە هوی چەسپاندنی تەواوی بیرە مادیەکان .

داکە گیان :

جەور و زورداری و ستەم گەلێك گرانە ، ئازار و ئێشی ئەم داشی بانە ، بوتە مایەی خوشکردنی ئەم ژیانە ، ئەو گورانەی کە سالەهای سالە گەلانی پێشکەوتوخواز گەیشتونی و تێامیویانە ئاسودە بژین ، بەلام دەرندەبی ئەو هێزەی کە دەمێوی لەسەر خوێنی جەماوەر و لەسەر پارەی بێکەس و رەش و روت بژی و .. سەموی ژیانێکی نوی تومار ئەکات . بەلام نەبونی گیانی تەواوی بیری مادی ، نەبونی رێکخستنی دیالیکتی و تاریخی ونەبونی سەر و کاری تەواوی رێکخراو هەمو ئەو گورانانە ، هەمو ئەو هەلچونانە هەمو ئەو بەرگریانە دەخاتە دواوە ، ئاوات و ئاما-نجی جەماوەر دەشکێنێ هێزێکی ناکامل بێك دەهێنی وئەتوانی بەری ئەو گورانە گەورانە بگرێ کە دەبێتە هوی رزگاری گــــەل . گەواتە بونی بیرە پێشکەوتوخوازەکان و دوری ئەو سەرکردانەی ئەمرو و گریدانی بە تەواوی واقیعەوە دەبێتە مایەی گەشەکردنی خەلك و هاندانی جەماوەر و چونە بەرەوەی خەلکی رەش و روت و چونە ناوی و گرتنە دەستی هێزی سەرەکی و لەناوبردنی ئەو کەسانەی تەنها بیریان وایە کە خەلك بو خوی چاك بێت و تەنها هەر ئەوانن ئەتوانن چاکی کەن و ری ی دا بەهێزی خێر بـــو

ئەوەی دەوری خوی بە راستی ببینێ و لابردنی ئەو کەسانەی لەو پایەیەی کە هەیانــــە .

سەردەمی ئەمروی ئەو شورشە بەستراوە بەو گورانانەی کەوا دیت بەسەر وەزعی تایبەتی ئیران و تورکیا و جیهان چونــکە ئەو بارەی کە دروست بوە لە ئیران پالپشتی تەواوی هیـــزە سیاسی یەکانی عیراق و ئەو شورشەی کە سەرچاوەی بەستنوە لە کوردستانەوە ، بەراستی هەست نەکردنی هەریەکیك لە ئیمە بەو راستیانەی کەوا لەم شورشە نویەدا هەیە بوتە هوی بــە فیرو رۆیشتنی زوربەمان و ساکاری بیرکردنەوەمان و گوی نەگرتن لە ئاموژگاریەکانی گەورە و خاوەن تەجروبەکان ..

حەزدەکەم چەند رچی هەیە بەکورتی بو توی بەریز باس بکەم و چون لەو وەزعەی دەرەوە گەیشتم و چەند بە ساکارانــە من چومە دەرەوە .

## نامەی ژمارە ٣٢

شەهید : دکتور ریباز

ڕۆژی ٢٣/ ٨/ ١٩٨٠

شەوی یەك شەممە

ژووری سێدارەی موسڵ

دایك دەبێ گیانی مەردی بکاتە بەرلاوەکەی
دایك دەبێت ببێتە نموونەی تێکۆشان بۆ ڕزگاری
دایك دەبێت بەرد موام گەشە بدات بە کۆرپەکەی
دایکی بەرێز و خۆشەویست

لەو هەستە بێرووزەی وەك نیزەی تیژ دەچەقێتە سنگی دوژمن ، لەو گڕەی کە دەروونی پڕ هیوا دەبیات بۆ ئاسمان و دەیسووتێنێ و تینکی دەدات و دەیکات بە کەلاوەکانی دوژمن ٠

بە پیرۆزی تو ٠٠٠ بەو سۆزەی کە تو بەخشیت پێم ، بە و پەروەردەیەی کە دەیبەخشی بە من . بەو خزمەتە گەورانەی کە تو بەریت کرد لە پێناوی مندا ٠٠

دایکی شیرین ، دایکی ئازیز

دەمەوی وەك کورەی ئاگر گڕ بەردەیتە دوژمن ٠٠ دەمەوێ ئەو ژیانە تاڵەی کە تو بەسەرت برد بیکەی بە هەستی ڕقاوی ، بیکەی بە کلپەی ئاگری خویناوی . دەمەوی وێنەم لە چاوەکانتا هەر بمێنێ تا ئەو ڕۆژەی تۆڵەی چەوساوەکان ئەسێنری . دەمەوی بەو جلە ڕەنگینەی کە ڕەش و ڕووتەکان دەیکەنە بەریان ٠٠٠٠٠ دەمەوی شاد بم بۆ بکەن بەو ئارەقەی کە کرێکاری برسی دەیڕێژێ

دەمەوی هەموو کوچە و هەموو دێهات گری ئاگری سووری لــێ بچەقینی تا هەموولایەك بەوردی بزانن ژیانی مەردی بریتیــە لە خەبات و هەولدان و مردن لە پێناوی شکاندنی زنجیرانــی پۆلایین ، سوتاندنی دەروازە بەهێزەکانی قەلا پۆلایینەکانــی دوژمن و نەهێشتنی جەور و زوردارێ لە نێو خەلك هەر دە بێ دەستی مەردی دریژ کەن . دەستی یەکیتی و برایەتی تــوند کەین ، ئازایەتی و زیرەکی پێکەوە گری دەبین ، دەبیت ئــەو ئارەزووە بەهێزەی کە ئێمە رەچاوی دەکەین ئێوە گەشەی پێبدەن .

دایەگیان :

ئەبێ ئێوە ببن بە دایکی رۆلەکانتان ، ببن بە نمونــەی بەرزی تیکوشان ، ببن بە هوی جولاندنی هەموو کەســـێکی ئەمرومان .

دایەگیان :

دەموایە بیری بەهێزی پیشکەوتوخوازی ئەمرومان لە نــێو ئێوەدا جەسپ بکردایە ئینجا بەرەو لای فراوانتر بروین ، دەمبێ خەباتمان دروست کردایە لەناو چاوی هەموو کەس و کارمانا ..

دایەگیان :

خوبەخت کردن لە پێناوی ئێوەدا پیروزە . گیان بەخشین لە پێناوی پاراستنی کەرامەت و شەرەفدا لە پێناوی ئەو دەرکراوانەی کە جێیان نییە بخەون تییدا ، مردن لە پێناوی ئــەو کۆڵ بە کۆڵانەی کە هەر روژەی لە کوچە و بازارێکن . ژیان بــۆ چی باشە کە خەلك ئاسودە نەبێ ، مردن لە پێناوی رەش و روتا نەبیت بوچی باشە ، دەبیت ئاسودەگی و خیر و خوشــی

ڕو خەلك د ڕوست كەین .

باوكان .. دایكان .. خوشكان .. برایان :

من د ەمەوی پیتان بلێم لە پیناوی ئازاد ی گەلی كورد دا د ەروین .. لە پیناوی سەربەخویی گەلدا د ەرۆین ..

دایە گیان :

من نەی كە م ، و من لە پیناوی نیشتماندا نەروم ئەی كـی بروات ، كەواتە پیویستی سەرشانی هەموومانە كە بیری خوسا ن بخەینە كار لە پیناوی ماندا .. و هەموومان ورد بیربكەینەوە كـە هەر یەكی لە ئیمە كە د ەروین با ش د ەزانین كە ئازاد ی د ەبینن و هەمو یەكیك كە د ەروات كەس و كار و دایك و باوك و خزمـی هەیە بەریشانن بوی .. پیویستە وا بیربكەینەوە ، هەموومان وا بیربكەینەوە كە كوری گەلین و كوری ئەو میللەتەین .

دایە گیان :

بیری ورد ی خوتان بخەنە كا ر نەك د ەست كەنە شیوەن و لیدان ، ئەمانە سود ی نییە تەنها سەربەرزی و شانازی كرد ن بە ئیمەوە و ئەو د ەستە ببر ن كە د ەیەوی ئازاد ی گەل بخنكینی .

دایە گیان :

د لی هەموویا ن بد ەنەوە ، بیری ورد یا ن بـو بكـەنـەوە ، فێریا ن بكەن كە ئازاد یا ن بو گەل بوێ ، د ەمانەوی شانـسـازی د روست كەین و خەبات كەین لە پیناوی ئازاد یگەل و لـــــە پیناوی سەربەرزی گەلدا و بو ئەوەی بە ئاوات و ئامانج بگەیـ ن پیویستە هەر خەبات بكەین .

## نامەی ژمارە ٣٤

شەهید : دکتور ڕیباز

---

ڕۆژی یەک شەممە
١٩٨٠/٨/٢٣

دایە گیان

دایکی بەهێز و وورە پۆلا یین
ئەو دایکەی کە دیمەنی لاوەکەی بەخێو کات بو گەل ....
بۆ ڕزگاری هەزاران لاوی دەربەدەر ....
دایە گیان :

هەموو کەسێک بە کوڕی خوت بزانە ، هەموو ئەو قارەمانانـە بە کوڕی خوت بزانە . و باش بزانە هەریەکێک لە ئیمە و ئەوانەی دەمرن دایک و باوک و خوشک و برای هەیە و سوزی هەیـ بەرامبەریان و دڵیان بە کوڕەکەیان خوشە و بە هیچ جوری حەز ناکات کوڕەکەی توشی زیان بێ . بەلام ئیمە تەنها کوڕی ئیوە نین بەلکو کوڕی ئەو خەلکەین . کوڕی ئەو خاکەین ، کوڕی ئەو ڕەش و ڕوتەین . دەبێت هەرکوڕێک و هەریەکێک کە گیانـی دادەنی بو گەل بەکوڕی خوت بزانی و باش بزانی کە تۆ سەر بەرزی و بەختەوەری دەتوانی شانازی بە ئیمەوە بکەیت چونکە دایە گیان زور چاک بزانە ڕیگەکەمان پیروزە و ئیشەکەمان بە نرخە و ئیمە لەسەر مافی ڕەوای گەلەکەمان دەڕوین . لە سەر پاراستنی شەرەف و کەرامەتدا دەڕوین . ئیمە شەهید ین بو گەل و قەت لە بیر ناچینەوە ، بە هیچ جوری لە یادی ئیوە نا

جینەوە . ئیمە دەبیت ببینە مایەی بەختەوەری ، ببین بە مەشخەل بو رزگاری گەل ، جمالە رەشی قارمان دەلێ :

شەهید بن و کاروان لە رەوتسایە
سەربەرزین و مەشخەلمان لە گەردایە

ئیمە گەشاوە دەبیت ئالاکمان ، پیروز دەبێت مالەکمان .

دایە گیان :

دەبیتە دایکی رۆلەیەك ، قەت ناوی ، وینەی ، لە چاوتا گوم نابێ .
دایکی بەریز و خوشە ویستم مایەی شانازی من و هەمو کەسیکم :

دایە گیان ، گیانی ئازایەتی ، گیانی خوشی دروست کەن لە ناو خوتانا زور بە گەرمی و دلسوزی ئەوگەنجانە پەروەردە بکە و دلخوشیان بدەرەوە و فیریان بکە دەست خوگر بن ، بە هیز بن ، ورەی بە هیزی ئەوان کار بکاتە سەر هەمو کەسیك ، ببیتە هوی گەشەکردنی روحی لە خوبردن ، روحی مەردایەتی ، دەبێت یارمەتی یان بدەیت زور بە چاکی و پەروەردەیان بکەی بەوپەری دلی قایمیەوە . بەرد موامیان کەی لەسەر خویندن ، بە هیچ جوری واز نەهینن لە خویندن و پی یان بگەیەنێ ، و خزمەتیان بکە ، تا بە باشی پێیان بگەیەنێت .

دایە گیان :

ئاواتە خوازم ، هانیان دەی و فیریان کەی کە ورەی نەپساوی ئیوە دەبیتە گەشەی تەواوی هەمو یەکیك کە داوای مافی رەوای گەلیکی چەوساوە دەکات .

نامەی ژمارە ٣٥

شەهید : دکتور ریباز

کورد ستان یان نەمان

یەکیتــی نیشتمــانی کورد ستــان

بەریز .....

سلاویکی کومونیستانە .

لە سەرەتای نوسین ( خەبات دەکەین بو رزگاری گەل لە نەزانی ) تیدەکوشین تا دوا تنوکی خوینی لەشمان بو رزگاری گەلی بن دەستمان هەنگاوی گەورە دەنیین بو بەجیهینانــی بیر و باوەری پیروزی مارکسیمان .

هەول ئەدەمین جیاکان ،دول و شیوەکان بکەین بە جیی گەی نیرکردنی چەوساوە و هەزاری دواکەوتومان ..لەپیــروزی گلی سەر لیوی تینوی شەهیدان بوتان رەوانە دەکەین جوا - نترین و رازاوەترین گولی سوری پر هەستمان ، بەرد موامئامادە بونی هەمو پیشمەرگە قارەمانەکان بو خەبات کردن لە پینــاوی رزگاری گەلمان ، توند و تولی ئەو ریکخستنەی کە جــــماوەر دەجوشینی ، هیوای ئازادی بو گەل دەهینی .لە دلی ئەو لاوەی کە لە ژیر لیدانی ئەم فاشی یانە رەق ئەبی .

ئاواتە خوازین ریبازی پیروزی مادی یانە نوینەری راستەقینە ی ئیوە بی ئەم تیکوشانە . گەیشتنی ئەو نامە پیروزەی ئیوەیبەریز زوری ئیمەی روناك کرد ەوە .. لیپرسینەوەی ئیوە شادیکــرد - ینەوە ، بەراستی شاد بوین کە زیاتر بمابنایەتەوە لە سەنگەری شەرندا زیاتر خەباتمان بکردایە بو ئەم گەلە و بە تــــەواوی ئاواتی پیروزی ئەو گەلمان بەجی بهینایە و یارمەتی تــەواوی

خەلکمان بدایە و چەکی مەردیمان بە تەواوی هەلگرتایە و زۆر لەگەل هاوریکانمانا خەباتمان بکردایە بەلام دوژمنی ستەمکەر و درندە ئەو ماوە دریژەی نەدا بە ئیمە و راپیچی کرد بنسە کونجی بەندیخانە و بوینە ژیردەستی ئەو درندانە ٠

بەریز :

ئیمە لەوپەری ورەی بەهیز و پتەوەوە ، لە شانوی سەرکەوتنی گەلەوە ئامادەین گیان بەخشین لە پیناوی رزگاری گەلمان ببینە مۆمی نەگوژاوەی سەر لوتکەکان ، بە هیچ جوری لا نەدەین لە ریبازی پیروزی تیکوشان وە هەمو یەکیک لە ئیمە کە دەگاتە بەر دەستی ئەم جەللادانە ، بەراستی دلی قایم و بەهیز دەبیو بەوپەری قارەمانیەوە دەکشین بەرەو مردن ، بەرەو پەتی رزگاری و من حەز دەکەم یەك بە یەك و ورد لەسەر هاوریکان بنوسم کە لیرەن ٠

بەراستی هاوری هەژار بە پیی ئەو پیویستیانەی کە لە زیندان و هەلس و کەوتی زور چاکە و ورەی بەرزە و تەنها غەمی ئەو بیرکردنەوەیە کە گیراوە و دورکەوتوتەوە لە ساحەی خەبات ئەگینا هیچ باکی نییە لە مردن و مردنەکەی بە پیروز دەزانی و زور لەسەرخو و وریایە و بەراستی هەمو برادەرانی زوری ئیعدام لی ی رازین و سیفاتی لیبوردن و شورشگیری زور چاکە و خاوەنی گەلیك تەجرەبەو کردەوەی چاکی ئەمرویە و هەموجاری دلی هەمو لە مواجەهە دەداتەوە و خەریکی تەنها ئەو مەعلومـ ماتانەیە کە عەلاقەتی بە شورشەوە هەیە و پەیتا پەیتا قسە دەکا لەو بارەیەوە ٠ هەرچەندە نامەی نییە بولای ئیوە هەموجاری رایدەگەیەنی بە من کە هەمو دەنگ و باس و قسەیەك هەیە

بینوسه بوبان لەباتی هەمومان و بە راستی هیچ کە م و کـوری وەهای نییە کە شایەنی باس کردنی بێ وەك باسی شەهید ان و خەباتی قارەمانان و چونیەتی تیکەوتنی و کەوتنە دەســـــت دوژمن .

هاوڕێ جەتۆ :

من بەراستی زۆر لی ی رازیم وە لە هەموبان چــاكتـــــرە وە لە هەمویان ڕێکوپیك ترە وە نمونەی پێشمەرگەی خـــــاوەن هوش و قارەمانیە وە هەرچەندە لە دەرەوە من باش نەمـــدە ناسێ بەلاّم لیرە زور جاکە وە پێ دەنێ بەو هەمو کـــــەم و کوریانەی کە هەیبوە و گەلێك لەسەرخویە و زور بیر و باوەری قایم و چــــاکـــــه .

تێبینی :

لیرە بەدواوە هەندی برگەی نامەکە پەیوەندی بە ئیـــش و کاری شورشەوە هەیە تا ئەگاتە ئەو شوێنەی کە دەلێ :

بەرێز :

گەیشتنی تو بە ناوچەکە و بەرد موام پەگژاچونی دوژمنـد ا زیاتر ئیمە قایم دەکات،بە راستی من لەو روژەوە دەگەرام کـــــه توی بەریز و هاوری بان هەمویان بچنە چەمی رێزان و دەمــــت بکەن بە خەباتی جماوەری وە ڕێکخستن لە ناوچەکەدا بـەلام نەگەیشتن بەو ئاواتە و نەمانتوانی بەو مەبەستە بگەین کە لەگـەل ئیوەدا بە دلێکی پر لە هیوا وە جموله و ڕێکخستن بکرێت لــــه ناوچەکەدا وە بیگومانین کە ناوچەکەتان گرد وە بە مـــەلبەنـــدی جولانەوە و شوینی دانانی بنکەی سور ، شوینی دەرچونـــی کلپەی ئاگر ... بەرد مم ئاگری دوژمن .

بێگومانین کە ئێوە نمونەی پێشکەوتوی هەمو ناوچەکانی تر و جێی فەخری ئەوگەلەن ، وە نوێنەری ڕاستەقینەی چەوساوە و ڕەش و ڕوتی ئەو گەلەن .

بەڕێزان :

لەم دواییەدا دوژمن بە جارێك دەستی کردوە بە بڵاوکردنەوەی درۆ لە بارەی ئەوکەسانەی کە لیرە ئیعدام کراون ، گوایە ئەمانە ماون و ئەوانەی لەوەپێش ڕویشتون هیچیان ئیعدام نەکراون وماون وە دەری ئەخا گوایە( صدام حسین ) بە هیچ جۆرێ ئیعدامی نەهێشتوە ، وەهەروەها لە ناو ناوچەکەدا بڵاوی دەکەنەوە کە مەلا زەوقی و حامید عمر شیخ ماون وە رەسی نەکراون ، بێگومان ئەمانە هەموی درۆن و تەنها بۆ تێکدانی لە کەس و کاری ئێمە و بێدەنگ بونیان لەم کوشتن و بڕینە وە ئەمە تی هەموی دەرخەری ئەوەیە کە دوژمن لەبەری بێ هێزدایە [illegible] بڵاوکردنەوەی [illegible] نمونەی ئەوەن کە تواناى نیە بە سەر وەزعەکەدا [illegible] کە ناتوانی لەبەر ناڵەباری زروف هیچ کەسێك ئیعدام بکات چونکە دوای هاتنەوەی ( تەنفیزی ) هاوڕێیان مەلا زەوقی و .. هتد . بەبۆنەی ئەو دەنگ و باسانەی کە پێیان دەگەیشت تەنفیزی هەمویان لە دائیرەیە و بەلام لە دوایدا بەرقیە هاتوە و وە وەستاوە .. ئینجا پاش ئەوە بە ناو ئەو خەڵکەی دینە ئێرە بڵاوی دەکەنەوە کە دەڵێن هەمویان دەرد مچن و هیچ کەسێك ئیعدام ناکرێت ، هەروەها لەم دوایەدا ژمارە یەکی زۆر لە ( هەیئە خاصە ) حوکم دراون و بەرمو( ابو غریب) ڕویشتون وە هیچیان پەنجەیان ( بی مورنەکردون ) وە هەروەها

زوربەی کات لە بەر دەرگا لە ناو خەلکا کە دێن بو لامـــان بلاوی دەکەنمود کە چەند کەسیك بەرەلا دەکرین ئەمـــانـە دەری دەخات کە زۆر بی هیز بوە و تزیك کەوتنیەتی وە هـــەر چەندە ئیمە بێ مەعلوماتین چونکە نە جەریدە و نە رادیـــو نیە لامان تەنها حەرەسیك نەبێ دیتە لامان ، ئینجا ئەوەی دەگاتە لامان تەنها بە هۆی مواجەهەویە و جوابی ئیـوەیـە ئینجا بە راستی ئەگەر بەردەوام شتمان بو بنیرن زور چاکـــە.

بەرێز :

بیگومان هاتنی تەیارە روژی ( ٣ جار زیاتر ) لەو روژە وەی کـــە شەرد ەستی پێ کردووە ( مەبەســت لە شەری ئیوان عیراق و ئیرانە ) بۆ سەر موسل بە تەواوی ترسی خستوتە دلیانەوە وە بە جاری گیانیان لە بەر براوە وە بەتەواوی ورەیان بەرداوە کە تەیارە چیان پێ دەکات ، چەند روژ کـــە هاتوە هەمو جاری لە ( مطار ) و مەعەسکەری داوە وە زیانـو. زوری پێ گەیاندوە وە یەکەم جار کە هات داى لە ( مطار ) و هەروەها زورچاك داى لە مەعەسکەرەکان وە هەمو جاریێهاتوە چاك لیێ داوە و بەرای ئیمە ئەو تەیارانەی کە بەسەر ئیمەدا هاتوە زیانی باشی گەیاندوە بە عیراق چونکە هەرچەنـــدە تەقەی لێ کراوە هیچ لیێ نەداوە وە بەردەوام رەمی خـــوی کردوە وە خەلك لەبەری هەلهاتوە وە هەروەها لەو روژە بـــە داوە تەیارە لە مطاری موسل بەرز نابیتەوە وە هیچ دەنگـــی نیە ، وە بە پێی ئەو قسانەی کە هەیە زیانی باش گەیشتـــوە بە مطار و مەعەسکەرەکان و نەوتی عەینزالە و شارەکانی تـــر ، بەراستی ئەوشتانەی لای ئیمە ئەوەندەمن وە ئەوەندە مەعلومات

لا ى ئيمه هەيە ٠٠ هيوادارين بێ بەشمان نەكەن لە هەوال و نامە ٠هەمو هاوری یان چەتو و هەژار و سامان عومەر و جلال و ایبراهیم و پیروت و ٠٠٠٠٠هەمو هاوری یان سلاویـــان هەیە بوتان یەك یەك ٠

سلاومان هەیە بو هەمو هاوریێ یان یەك یەك ئیتـــر زور سوپاسی ئەو هەستەتان دەكەین وە زور شادین كە ساحیبی ئەوەی بەریزین ٠٠

سەربەرزی و بەختەوەری هەر بو شورشگیرانە
مردن بو دوژمنانە
بو پیشەوە بە سەركرداەتی یەكیتی و ریكخستنەكەی
بژی خەبات ٠٠٠بەری ئاشست

هاوریی دلسوزتان
ریباز
شەوی ٣٠/٩/ ١٩٨٠

## نامەی ژمارە ٣٦

شەهید : دکتور ڕیباز

کوردستانی گەش و ڕون

بەرمو پیری مەرگ فەرسەخ بە فەرسەخ ڕۆیین مەردان
ئەوەی باکی لە مردن بێ دیارە بلح و نـــــامەردە

سلاوێکی پیروز بو هەموان ، سلاویك هەلقولاری ئەوانـەی کە هەمیشە بونە مایەی رزگاری گەلیان ، سلاوی ئەو هیزەی کـە لەناو گەلدا بنجی بەستوە و وزەی نەپساوی دەکەنێ بو بـنیاتنانی ڕوژێکی گەش و ڕون بو هەموان ...

ئەی ڕۆلە نەمرەکان :

ئەی چەوساوەکانی هەو جیهان یەکگرن ،لە پیشـــــاوی روخاندنی فاشی یەکان ..

ئەی دەربەدەر و خاوەن مافەکان ، دەنگەکان ، تسەتان ، هیزتان ، بیر و باوەری گەشتان ، ڕێکخەن و بیکەن بە چەقـلی تیژ بیکەن بە چاوی دوژمنان .

زور ڕون و ئاشکرایە هەتا ژیان نەکاتە خەباتی چینەکـان و چەوساوە کریکارە نەمرەکان ، دەست نەکەن بە خەباتی بێ وچان قەت ژیان دروست نابێ ، ژیانی شاد بو هەمو گەلان ئەی براو خوشك و خزمان ، دایکی پیروز گیان .

باش بزانە مردنەکەمان سەربەرزی یە ، شادی یە ، بەختەوەریە .. مایەی نەبراوەی ئیوەیە ، هیچ کاتی وا بیر نەکەنەوە بەم مردنە تەواو ئەبین ، ئیمە نوینەری هەزار و چەوســــاوەی

کورد ین ، ئیمه بریارماندا که هەمیشەو هەموکاتێ لە پێناوی ئاواتەکانی گەلدا بمرین و خەباتمان کرد کە ئێوە بە شـــاد ی بژیـــن ..

بەراستی خەباتکردن پیرۆزه ، مایەی شانازی هەموانـه ، ئێمه داوا له هەموگەلەکان دەکەین دەنگیان بکەنه یەك و پر به دەم هاوارکەن : ئەی کریکارانی جیهان و زورلیکراوان یەکگرن ئیمه داواتان لێ دەکەین به سەربەرزی بژین ، داواتان لـێ دەکەین گورەکانمان سور کەن به خوینی گەش و به شیعـــری خاکی ی بیکەس :

کرێکارێکی دوا روژی ئەم گەلەم
هیچ سڵ ناکەم بو مردن له پیناوی ئازادیدا
ئێمه دەمانەوی سەربەستی بو گەل بێنێک بهێنین
ئیتر ئیوه و روژیکی شاد بو هەموتان ، روژێکی کامەران بو هەموتان .

ئیتر بژین کورتان

ئیبراهیم مەحمود ( پەباز )

قەسابخانەی موسل ۱۲/ ۱۰/ ۱۹۸۰

## نامەی ژمارە ٣٧

شەهید : دکتور ریباز

ئەی دایکی کوری شەهیدان
ئەی برا و خوشکە بەرێزەکان

بە هیچ جورێ وا بیرمەکەنەوە کە مرد نەکمان تەنها بـــــو ئێوەیە بەلکو مردنی ئیمە مانایەرزگاری گەلە ·

ئەو روژەی چرای شادی و ئازادی دادەگیرسێ · ئیـــــمە و سەرنامەی تولەی شەهیدان دەسیتری خەباتمان بەرەو دەسێ بەرەو پیکهیبانی ورەی بەهیز ، بەرەو دوارۆژیکی شاد پیویستە ئیمە لە بیناوی ئازادی گەلدا بمرین و خومان بەخت کەین لـــــە بیناوی دوارۆژیکی شاد و کامەران ·

ئەی روله نەمرەکان
ئەی دایکی قارەمان

بە هیچ جوری ورەتان نەروخی بەرامبەر هیزی ئەم فاشی یانــــە دەبیت مایەی شادی و سەرکەوتنی ئەو خەلکە بێت ، دەبیـــــت تورەیی ئەو خەلکە بەهیز کەیت ، دەبیت ئازادی بو گەل بێنی ·

دایە گیان :

ورەی هەموان بەرز کەرەوە ، ورەی روله نەمرەکان قایم کە ، بـــە هیچ جوری کاریکی وەها نەکەن ورە بەرد ەن ، تکایە ریک وپیکی بدەن بە خوتان ، سەربەرز بن ، شاد و ئازاد بن ·

بیگومان دەبێ ئازاد بن ، سەر بەرزبن ، ورە قایم بن ، دەبێ نوکی رم بن بو هەمو بەربەرەکانی یەکی فاشی یەکـــان ، نەبەرد و شیرانە بن ··

٧٢١

ئازادی خوای کورد ین ئیمه
شورەی پولا و بەرد ین ئیمه
پشتی جوتیاری زەبونیـــــن
ئالای بەرزی چون یەك بونین

ئیتر هەموتان شاد بن
هەر بژین بە کامەرانی بو رزگاری هەموان ٠

کورتان
ئیبراهیـــم مه حمـــود
قەسابخـــانـــەی مـــوســــل

نامەی ژمارە ٣٨

شەهید : هاوری

ئەی کریکاران و گەلانی چەوساوەی جیهان یەکگرن

(( مروڤ بە نرخترین سەرمایەیە ))

بو هاوریی خوشەویستم ،نوری چاوم ، کاکە .....

روژ باش

پیشەکی گەرمترین سلاوی دلسوزیت ئاراستە ئەکەم و زور بە عەزرەتەوە م ئەملا و ئەولات ماچ بکەم . سلاو و ریزی من بو برایەکی وەك توی خوشەویست بە م چەند دیرە کوتایی نایەت ، دەموی هەندی وشەی وات ئاراستە بکەم کە لە هیلانەی دلەوە دا ئەهینیانە شەقەی بال و کیو و چیای ئاسمانی هەژارەکانی ئەم کوردستانە .

هاوریی بەریزم نامەیەکی ترم بو ناردی نازانم بە دەستت گەیشتوە یان نا . کە گیرام لە " ئە من " وتیان کیت لەگەلدا بوە من ئەموت کەسم لەگەلدا نەبوە ، ئەوان ئەیانوت (( ..... )) لەگەل تودا بوە .

کاکە "......." :

زور سوپاسی هەستی هاوری یانەت ئەکەم ، لە ئە من بیستم کە کاك " ..... " گیرا باسی دلسوزی توی بو کردم کە وتوتە ( هاوریم ) گیراوە با بچین لە ئەمن بدەین ، هاوری گیان من زور پیخوشحال بوم وام دەزانی کە نەگیراوم ،ئیسپاتت کردکە هاوری یەکی دلسوز و شورشگیری .

هاوری :

باسی شەرەکەی ( برایماوا ) یان بو کردم زور پیخوشحال بوم کە هاوری یەکی وا قارمان و نەبەزی وەکو تومم هەیە ، ئەگەر ئیعدامیش‌کریم دەربەست نیم • هاوری نازانم چیت بو بنوسم‌لە سەر ئەم نامەیە کوتایی نایەت •

هاوری :

دوای شەرەکەی برایماوا منیان بانگ کرد بو ( تەحقیق ) و هەر باسی تویان ئەکرد منیش‌ئەموت زور فقیرە ، دوایی(مدیر امن) لەگەل (( قادر فەرەج )) و یەکی تر ( نەم دەناسی ) لی یان پرسیم (( ••••••)) چونە و شکلی چونە ، و منیش‌بـــــــە ئەکسەوە وەسفی تومم بو دەکردن و دانیان لی ئەکروژیت •••• هاوریی قارەمانم ئاگاداری خوت بکە و لە ئیشەکانتا زور وریا بە•

برا گیان :

پیشمەرگە لەتیف حەمە سالح کە ناوە نهینی یەکەی کامەرانە لە بەردەمی فاشیستەکاندا هاواری ئەکرد و هوتافی ئەکیشا زور بە قارەمانەتیەوە کە بردیان بو رەمی لە سەر شەقامی رەئیسی‌هەر هوتافی کیشاوە ، خوت ئەزانی کە ئەم پیشمەرگە نەبەزەی لای تو دەستیان کورتە ، کەسی نییە یارمەتی یان بدات ، ئینجا تکام وایە دەستی یارمەتی یان بو راکیشیت ، ئەزانم کە تـــــــو زور دلسوزیت لە هەمو رویەکەوە • هیوام وایە و داوات لی ئەکـــــەم کە مەفرەزەیەکت بە ناوی شەهید (( کامەران )) وە ناو بنی ی چونکە پیشمەرگەیەکی قارمان بو ، ئیتر خوشیت ئاواتمە •

هاوری : هاوری
لـــــە ژوری خنکانـــــــدنـــــــدا

## نامەی ژمارە ٣٩

شەهید : جمال قادر جوامیر

مردن لە پیناوی کوردستان بێ
سەد ژیانی بە قوربان بسێ
ئاواش نەبوایە هەر دەمردم
کەسیش یادی نەدەکردم

بو برای خوم کاك ......

پێشەکی زور سەلامت لی ئەکەم و ئە ئەحوالی شەریفت دەپرسم و هیوادارم هەردەم بژیت بە خوشی و شادی دووربیت لە هەمو ناخوشی یەك و ئەگەر توش لە هەوالی من دەپرسیت دەچم بو ئەو رێگە پیروزەی کە هەزاران رولەی بەشەرەفی وەکو من لە پیناویدا خەباتیان کردووە ، بەلێ بو کاروانی شەهیدانی کوردستان .

تێبینی : نامەکەی شەهید جمال بریتی یە لە چەند خالێك زوربەیان پەیوەندی یان بە کار و باری رێکخستن و شورشەو هەیە و لە روژێکی وەك ئەمرودا بو بلاوکردنەوە ناشین تا ئەگاتە ئەو شوینەی تیایدا ئەلی :

داوات لی ئەکەم بچیتە لای باوکم بو ئەوەی دلخوشی بدەیتەوە چونکە من نەك کوری باوکی خوم بوم بەلکو کوری ئەم ، کوردستانم .

شەهیدان :

١ ـ جمیل احمد محمود / ئازادی / هەولیر

٢ ـ جمال قادر جوامیر / ماوەت / سلیمانی
٣ ـ علی محمد امین / سید سادق / سلیمانی

$\frac{٢٠}{٢١}$ / ٥ / ١٩٨١ لە سیدارە دراین

لە قەسابخانەی موسڵ

تێبینی : ئەم نامەیە چەند ساتێك پێش لە سێدارەدرانی ئەو ئەو سێ شەهیدە قارەمانە نوسراوەتەوە لە لایەن شەهید ( جمال قادر ) ەوە ٠

نامەی ژمارە ٤٠

شەهید : جمیل احمد محمود
تێبینی : چەند ساتێك پێش لە سێدارەدانی نوسراوە

کەم بژی گەل بژی
خەبات کردن تا سەرکەوتن
بو هەڤالی تێکوشەر (( ...... ))
سلاو

بەلێ من لە ژوری سێدارەدام ، نزیکەی ( ٣ ) کاتژمێرم ماوە بو ئەوەی دنیا بەجێ بهێلم و ریگای راستیم گرتە بەر . رێگای رزگاری گەل ، و باشتەوەی لە خەبات کردن بەرد ەوام بـووم دژی داگیر کەر ، ئەو دوژمنەی کە بە خوێنی روڵەکانمان تینوە . و هیوادارم شورش سەرکەوتوبێ بەسەر خوێنمژی بەعسی .. و من لە ریکەوتی ١٢ / ٧ / ١٩٨٠ لە هەولێر گیرام بە دەستی دائیرەی ئەمن و لە ریکەوتی ٢٩ / ١٠ / ١٩٨٠ حوکمی سێدارەم درا لە کەرکوك ( هەیئە خاصە ) ، و من لەریکەوتی ٢٠ / ٥ / ١٩٨١ سێدارە کرام و دەرچوی ( مەعهەدی فەننی ) م لە سالی ١٩٧٨ تەواوم کرد و باوەرنامەی دبلومم وەرگرت ، و لە کاتی خویندنەوەی سێدارەم بەیەك دەنگ هاوارم کرد بژی مردن بمری دوژمن و بە هیچ جوری من لە مردن نەترساوم بەلکو بە پێچەوانەوە مردن لە ئیمە ترساوە و هەروەها لەگەل خوم دوکەسی تریش سێدارەکران کە ئەمانە ناوەکانیانە :

١ ـ جمیل احمد محمود / ی.ن.ك / ك م ل / هەولێر
٢ ـ جمال قادر جوامیر / ماوەت / سلیمانی / ی.ن.ك

٣ ـ علی حمه امین احمد / سید صادق / ی.ن.ك

له ماوەی رابردودا دو نامەم بو رەوانه کردی جا نازانم بـــه دەستت گەیشت یا نا وە ئاگادارم کردیتەوە له چەند کارەساتێك جا هیوادارم جی به جی ی بکەیت .

هەزاران سلاو له گشت شەهیدانی ریگەی رزگاری گەل
هەزاران سلاو له شەهیدانی کوردستان

جمیل احمد محمود ( دەرسیم )
ژوری سیدارەی مـــــوســـــل
١٩٨١ / ٥ / ٢٠

## نامەی ژمارە ٤١

شەهید : عمر میرزا

تێبینی : ئەم نامەیەش تەنها چەند ساتێك بەر لــــە سێدارەدانی شەهید نوسراوە .

ئەی کرێکاران و زەحمەتکێشانی جیهان یەکگرن !

سلاوێکی شۆرشگێرانە ..
بۆبرای شۆرشگێرم (( ..... ))
بەرێز سلاوت ئاراستە ئەکەم وە لە ئەحوالت پرسیار ئەکــەم

بۆ ئاگاداریت :
تا بێ بەهیچ جۆری رەحمتان هەبێ بەرامبەر فاشستە بەکرێ گیراوەکان دلتان نەرم بێت شۆرشگێریتان بۆ ناکرێت چونکـــە دوژمن نا مەردانە رۆژی ٥ و ١٠ و ١٥ ئیعدام ئەکات ئەوە بو و لە چوار شەممەی ٢٧ /٥ /١٩٨١ ، ( ٥ ) شۆرشگێری لێ کردین بە دارا :

| | |
|---|---|
| ١ ــ عمر میرزا | سلێمانی |
| ٢ ــ تاهیر عبدالله | زاخــو |
| ٣ ــ مجید عیسی | زاخــو |
| ٤ ــ دارا حمید | کفــری |
| ٥ ــ علاءالدین توفیق | کفــری |

ئێمەش هیوادارین ئەو خوێنەمان کە دوژمن ئەیرێــــژێ تۆڵەی بسێنن ، یادی ئێمە لە ئەستۆتانە .

وەسیەت بۆ (( ..... ))

سلاویان لی ئەکەم وە من لە پیناوی کورد ستان شەهید کرام وەکو شیر دەچم بەرەو پەتی سیدارە ئەبی تولمان بسینن مەردانە • ئەمرو روژی چوار شەممە ٢٧/ ٥/ ١٩٨١( بەتایبەتی هەمو چوار شەممەیەك ئیعدام هەیە ) ، گیڤارای گەرمیان کە لەم بەیتەدا گیرا نامە دەنوسی •سلاو لە هەمو لایەك دەکات ئیستا لە گەل ( ٣٤ ) قارەمانی تر لە زوری سیدارەی موسل ماون •

تیبینی :

داواکارین بە ناوی هەمو شەهیدانەوە کول نەدەن هەتا سەرکەوتن ئەمرو روژی تولە سەندنە • روژی دل نەرمی نیە • منال و ئافرەت و گەورە لە ژیر تەعزیب و ئیعدام سەرئەبردرین ، هەزاران دایکی جەرگ سوتاو ئاوارە بولە یادیان نەکەن ، هەمو روژی گریانە لە موسل تاکەی رەحم ، خەبات •• خەبات • تفەنگ •• تفەنگ ••روژی گر بەردانە لە ورگی دوژمن •

لە یادمان نەکەن ، ئیستگەی یەکیتی هەر قارەمانیك شەهید کرا دوای شەهید بونی ژیان نامەی و خەبات کردنی هەمو باسکری با دوژمن بزانی ناویان هەیە و کەس و کاریش پی ی خوشە باسبکرین لە بەر ئەوە دەبی کە بەرنامەیەکی تایبەتی بو شەهیدان دابنریت وە ئەم وەسیەتە ئەبی جی بەجی بکریت •

شیر گەر لە ریوی بترسی شیری نیو مەیدانی چی
لاو لە گیان کیشان بترسی هەول و تیکوشانی چی

خواحافیز •••

کاك (( ...... )) ، کاك (( ...... ))
هەمو پیشمەرگەکان
ئەمرو سەعات ( ١٢ ) ی شەو لە سەیدارەمان دەدەن •

---

زوری سیدارەی موسل
عمر میرزا

نامەی ژمارە ٤٩
شەهید :کامەران جەلال

بسم الله الرحمن الرحیم

رۆژ باش .
ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد .

بو بەرێزان و شورشگێران و قارەمانانی کوردستان ،کەرتی قەرەداخ پیشەکی سلاوێکی گەرمت ئاراستە ئەکەم کـــە لــــە دەست و تفەنگی پیشمەرگە قارەمانەکان بە هێزتربێت .لە گولالـە سور ئالتر بێ کە خوێیان بەخت کردوە و رەنگی خوێنی شەهیدانیان بەرزکردوتەوە ، هەر لە زیندانی تاریکی فاشیەکـانـــەوە سلاو و ریز بو تۆ و هەموو پیشمەرگە قارەمانەکان .

تێبینی :
ئێرە بە دواوە نامەکە پەیوەندی بە باری ناو خوی شورشەوە هەیە ، بویە بلاوکردنەوەی بە چاك نازانین .

هــاوڕێتان
کامــەران

## نامەی ژمارە ٤٣

شەهید : کامەران جەلال

---

ئەی کرێکاران و زەحمەتکێشانی جیهـــان یەکگرن !

بو لای / برای شورشگێرم کاك .....
سلاویکی شورشگێرانە .

بەڕیز : یەکەم لە ناخی دلەوە جوانترین سەلامت لی ئەکەم چون سەلامیك ... ئەو سەلامەی بەتین تر بێت لە بیر و باوەری یەکێتیمان ... جوانتر بێت لە بەهاری جیاکانی کوردستـــان ، لە ناو سیدارەی ( موسل ) وە خوم بە بەختیار ئەزانم کە توانیم ئەم نامەیە بنوسم وە رەوانەی لای تۆی خوشەویست و شـــەروش گیری بکەم وە هیوادارم هەردەم بەرز سوام بن لە سەر شـــوڕش کردن دژبە نیزامە بۆگەنەکەی بەعسی چون ئەوا ناجوامێرانـــە لەگەل ئیمەدا ئەجولینەوە ، روژ و شەو ناکەن لە بو قەلاچوکردنی گەنج و لاو و پیری کورد ، روژی ٥ــ ١٠ ــ١٥ لە سیـــدارە ئەدریـــت .

لە ناو شاری قارەمانی کەرکوکەوە یا سایەکی تەپەدوریـــان داناوە لە کاتی حوکمدانی گەنجە کوردەکاندا پێکی ئارەق لای خوی دادەنیت ، زور بە مل هوزری و بێ رەحمانە یـــاســـای مردن ئەدات بە سەرماندا ئایا ئەبێت ئیمە تاکەی بە بەزەییەوە لەگەل ئەو رژێمەدا بجولینەوە ، ئەرکی تولەسەندنەوەی ئـــەم

هەمو تاوانانە وا بە ملی ئێوەوە چونکە ئێوەن لە ڕێگای قەلاچـــو کردنی ئەم نیزامەدا چەکی شۆڕشگێڕیتان کردۆتە شان ، بەڕێـــز ئەم هەوالانەو سەد ئەوەندەی تریش هێشتا ئەوەندە تـــەواو ناکات کە بچوکترین نهێنی بە عەس دە ربخات ئەوە بزانن هەتـــا ناو دەستەکانیشیان پڕ کرن وە لە شۆڕشگێری کوردستان وە زور پشیان بێ تاوانن ئەوەندە نەبیت کورد ن هیچیان بەسەرەوەنیە •

تێبینی :

من کە ناوم کامەران حەلا لە یەکێك بوم لەوانەی کە لە تەمەنێکی زور بچوکەوە هەستم بە چەوساندنەوەی گەلەکەم کردووە خوم تەرخان کرد لە پێناوی گەلەکەمدا ، وە هاتم پالم دا بە پالی برا شـــورش گیرەکانەوە خوم زور بە بەختیار ئەزانی کە شەو نخونیم ئەکرد و ڕێگای پڕ مەترسیم ئەبری وە بە هیوای ڕوژێکی پڕ لە شادی بوم و نەمدەزانی چون شەو و ڕوژ بەسەر ئەچو بەس ئەوەندە نەبێ بیرم لەوە دەکردەوە چ کاتێك دوژمن چوك دادەنەوێنیت لـــە بەردەم قارەمانەکانماندا ، بەلام بەداخەوە بە هیوای خـــوم نەگەیشتم . نەگەیشتم بە ئاوات ، پڕ بە دلی خوم خەباتـــم نەکرد . لە پڕ کەوتمە بەردەستی خوفروشەکانی بە عسی کەوتمـــە دەست جاش و ئەوانەی خویان داوەتە باوەشی بـــەعس بـــە خویان و ژن و مندالیانەوە باسای گیان کیشانیان بەسەردا سپاردم . ئیستا لە ناو ژوری سیدارەی ـ موسل ـ دا چاوەری بو مەرگ ئەکەم . هەمو تولە سەندنەوەی من وا لە ئەســـتـــوی ئـــیـــوە •

ڕۆژی گیرانم ١٠/ ٣/ ١٩٨١
د رام بە مەحکەمە ٢٣/ ٥/ ١٩٨١
کاتی نوسینی نامە ٣١/ ٥/ ١٩٨١

دلسوزتان
کامەران جەلال
کەرکوك ـ گەرەکی ئیمام قاسم

.ئیتر بو پیشەوە لە ژیر ئالای یەکیتی ماندا ...

نامەی ژمارە ٤٤
شەهید : شاسوار بازیانی

کوردستان یان نەمان

١٩٨١/٦/١

لە بەندیخانەی "موسل"

بو / هەمو هاوریٰ یانی بەریز و شورشگیرم
سلاویٰی گەرمی شورشگیرانەتان لیٰ دەکەین

هاوریٰ یانی ئەزیزم :

لە بەر نەبونی پینوس و پەراو لە بەندیخانەدا ، ســــەر زارەکی ئەم چەند وشەیەی لای خوارەوەتان بو رەوانە دەکـــەم بە هاوریٰیەکی خوٚمدا کە لە بەندیخانە چاوم پیکەوت و بە هەلم زانی کە رایسپیرم بوم بخاتە سەرپارچەیەك پەراو و ئــــەمـــەش دەقی وتەکانە :

پاش ئەوەی کە ئیمە گیراین بردمانیان بو هەیئەی سلیمانی وە لەویٰ دەستیان کرد بە ئەشکەنجەمان و لیدان وە لــە گەل ئەوەشدا ئیمە بە هیچ جوٚریك هیچمان نە ووت وە زانیان سود مان لیٰ نابینن هەتا هاتن دو خوفروشیان هینا کە ئیمە چماو مان بیٰ یان نەکەوت بەلام بە ناعەون وت و ویژیان ئــەکـــرد لەگەل کاربەدەستانی (( دائیرەی ئەمن )) تەلەفونــەکــە دور حتی هەبو ، خەتیکیان ئەدرا بە لیپرسراو و ئەوی ترئەدرا بە من . شاهیدیان دا کە گوایە من هەلساوم بــــە کوشتنی (( . . . . . . )) لە لایەکی ترەوە گوایە کە من لیپرسراوی هەمو ناوچەی بازیانم ، وە ئەمەش هەندیٰ لەو سزایانەیە کـــە

دڕندانە بەرامبەر بە ڕۆڵەی گەلی کورد ئەیکات ، هەر لە کتێبی ژمێری ٧ی ئێوارەوە ئەیانبەستنەوە بە پانکەوە تاکو ٧ی بەیانی لەگەڵ ئەوەشدا دەهاتن دوبتڵ غازیان دەخستە سەر شانمان ئەم لام دوان و ئەولام دوان ، ئەمجا بە کێبڵ لێیان ئەدایین ، ئووتویان ئەهێنا بەسەر سنگماندا بۆ حەوارد نیشان نە ئەدایینێ ، ئەوەی ڕاست بێ هیچ زوبانێ ناتوانێ باسی سزای ئەم فاشی یانە بکات کە بەرامبەر ڕۆڵەی گەلی کورد ئەیکەن وە پاش ئەوەی کە بە لێدانێکی زۆر لێیان دابین ناچار بویین لەگەڵ ئیمضادەی ئەو دو خوفروشانە ( اعترافـ ) مان کـرد ، پاشان ڕەوانەی شاری کەرکوکیان کردین ، وە لەوێ دراین بە مەحکەمەی (( المحكمه الخاصه فی التأميم )) لەو دادگایە چەند کەسێك دانیشتبوو گوایە پارێزەر ( محامی ) بو لە سەر ئێمە ( دفاعی ) ئەکرد ، بەڵام هیچ ئەوەندەی پرسی وتی کورم ئەو ئیفادەیە هی ئێوەیە وتمان بەڵێ لەبەر لێدان ئەو ئیفادەیەمان داوە ئیتر پرسیاری نەکرد ئێستا ئیفادەتان چونە کە حوکم دراین بە ئیعدام محامی یەکە وتی جەنابی حاکم ئەمانە منالن وتی نەخێر ئەمانە گەورەن بەڵام بە ( دفتر النفوس ) منداڵن وە هاتن تەمەنمانیان گەورە کرد و لە ڕۆژی ١٨/ ٥/ ٨١ ڕەوانەی شاری موسڵ کراین ، وە لەوێ چاومان کەوت بە قارەمانەکانی میللەتی کورد کاك جەلال سورداشی و کاك عمر میرزا ، یەکمیان خەڵکی ناوچەی سورداش بو کە هەرچی کاربەدەست و موچەخوری بەندیخانەبو لە پاڵەوانیتی ئەم دلیرە وە لەکاتی قسەکردندا نەیان ئەویرا بەرامبەری گفتوگوبکەن ، سەری بە هەمویان شور ئەکرد و باسی ڕورەشی میری ئەکرد و جنێوی پی ئەدان وە هاواری بو سەربەرزی کورد و کوردستان ئەکـرد وە

پاشان بردیان رەمیان کرد و خۆی کرد بە قوربانی بەندییەکە و
ولاتەکەی ، گیانی پاکی سپارد لە پێناوی کورد و کوردستان
بە هەروەها کاکە عەرەبیش هەڵواسرا و گیانی پاکی سپارد بە
خاکی ولات ، وە ئێمەش شانازی پێوە ئەکەین کە رۆژە و پەیڕەوی
ئەو رێگا پیرۆزە ئەچین تەنها یەك شت هەیە کە ئەو کەسانەی
حوکمی ئیعدامی بۆ دەر ئەچێت ئەگەر تەقریری لە سەر
بڕوات بۆ بەندیخانە ئەوا زۆر بە هەڵی ئەواسن .

لە کۆتاییدا ، داوای سەرکەوتنتان بۆ ئەخوازم وجارێکی
تر سەلامتان ئاراستە ئەکەم .

داری ئازادی بەخوێن ئاو نەدری قەت بەرناگری
سەربەخۆیی بێ فیداکاری ئەبەد سەرناگری

براتان
شاسوار بازیانی
فەرماندەی کەرتی هەڵمەت
١٩٨١/٦/١

## نامەی ژمارە ٤٥

شەهید : یاسین محمد حسن

(( وەسـیەت ))

بو خوشەویستی خوم (( ٠٠٠٠٠ ))

پیشەکی هەرد وچاوت ماچ ئەکەم ،وە ئەحوالت ئەپرسم وە ئومید موارم کە لە خوشیدا بژیت ٠٠٠

چاوەکەم :

لە کاتیکدا ئەم نوسراوەم بو نوسیت من هەمو کاتیك چاوە روانی مردن ئەکەم وە بویە بەم نوسراوە ئاگادارت ئەکەم بو ئەوەی کە لات بمینیتەوە بو یادگار ، من لە کاتگای دلەوە زور زور سوپاسی تو ئەکەم وە من ئەلیم خوا ئاگای لی یە کە ئەوند ٠ ئافرەتیکی ژیر و جوان و داوین پاك و میرد خوشەویست بوی وە من ئەلیم کە وینەی تو زور کەمە لە ناو گشت ئافرەتیکدا ، بە راستی گشت کات و ساتیك جیگای شانازی من بویت و نیشانەی راستی و پاکی بویت ٠ بە راستی نازانم چون وەسفت بکەم ٠

چاوەکەم :من ئەم وەسیەتەت بو ئەکەم لەپاش مردنم بو ئەوەی کە لە سەری بروێیت :

یەکەم : ..............................

انشا الله لەو دنیا بە یەکتری شاد ئەبینەوە وە نابی بە هیچ جوریك غەمبار بییت چونکە من لە ریگای شەرەف و کەرامە تی میللەتەکەمدا ئەروم ٠ وەکو خوت ئەزانی کە من تەنها هیوام سەرکەوتنی میللەتەکەم بوە و خاکەکەم رزگار بکەم جا زور شانازیە کە لەم ریگایەدا بمرم ٠

دوەم : ئەو حاڵ و حاڵەی کە هەمو گشتی بو تو و منالەکانە وە تۆ خوت ئارەزوی خۆتە لە گوی دائەنیشیت ... هتد

سی یەم : منالەکان لای خوت بوت وە بە هیچ جوریك بەرەڵا یان نەکەیت و تەربیەتی باشیان بدە تاوەکو گەورە ئەبن و دەبنە مروڤیکی باش و لە قوتابخانە دوانەکەون بۆ ئەوەی خزمەتی گەل و نیشتمانەکەیان بکەن و بە هیچ جوری ریگای مالی باوك و دایك و کەس و کاریان لی مەگرە و خوشت هاتو چویان بکە و دایم لەگەڵ یەکدا ریك بن و دلی یەکتری عاجز مەکەن و زور غەم نەخوریت و دوای من وە نمونەی خیزانی شەهید یك بیت و نابی دلی ئەو منالانە عاجز بکەیت و بی باوکیان بەوە دیار بیت و وا بزانن کە باوکیان نیە .

چوارەم : لە خیر و خیرات بی بەشم نەکەیت و قورئان و (( خەتم )) م بو بکەن وە من گەردنت ئازا ئەکەم و لە ریگای خودا وە توش گەردنی من ئازا بکە لەوەی کە بوە ئەرزاری تو لە گشت شتیك وە گەردنی دایکت و منالەکانی ئازا بیت وە ئەوانیش گەردنی من ئازا بکەن گشتیان گشت کەس و کار و دوستیك .

پینجەم : وا ئەمجارەش ئەلیم ئاگاداری منالەکان بە بە خو و رەوشتیکی جوان پەروەردیان بکە وە با بخوینن بە هیچ جوریك نابی واز لە خویندن بەینن .

ئیتر بە خوات ئەسپیرم     یاسین محمد حسن
١٩٧٧ / ٤ / ٣٠

## نامەی ژمارە ٤٦

شەهید : یاسین محمد حسن

### (( یادگارێك بۆ سناریا و ئەشکەنجە ))*

چاوەکانتان ماچ ئەکەم وە داوام لە یەزدانی گەورە ئەوەیە کە بتان پارێزی وە خوا تەمەنتان درێژ بکات و پلە و پایەکی چاکتان بداتێ ، بۆ ئەوەی کە خزمەتی خوا و پێغەمبەر و نیشتمان و نەتەوەکەتان و مرۆڤایەتی بکەن .

کۆرپە شیرینەکانم :

لە کاتێکدا من ئەو نوسراوە ئەنوسم مەرگ هەمو رۆژێك دەرگامان بۆ ئەگرێت وە هەمو رۆژێك چاوەڕوانی مردن ئەکەین وە چەند برایەکی خۆم لەگەڵ چەند برایەکی تری کورد بەرەو خنکێنران و گوللە باران کران . ئێوە زۆر منال بون ( سناریا ) گیان تەمەنی لە چوار سالی کەمتر بو وە قسە و کردارە جوانەکانی ئێستەش لە بەرچاومە وە قسە خۆشەکانی لە گوێمدا ئەزرنگێنەوە .

---

* سناریا و ئەشکەنجە : دو منالی بچوکی شەهیدن .